

# فێڵی شەیتان

## لە دوژمنەکانی الرحمن

## وە دۆستەکانی جهم بن صفوان

لە وەرگرتنی عەقیدەی کوفریان
لە فەلسەفەی ئیغریق و یۆنان



النووي بە نموونە


**عبدالملك الأثري**



١٤٤٥هـ


زنجیرەی چقڵی چاو و دڕکی قوڕگی بەرگیریکاران لە ئەشعەریە جەهمیەکان : (٤)

قَالَ تَعَالَى:

﴿ لَقَدۡ جِئۡنَٰكُم بِٱلۡحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَكُمۡ لِلۡحَقِّ كَٰرِهُونَ ٧٨ ﴾ (الزخرف)

کاتێک دێیت باسی ئاثار و وتەکانی سەلەف ئەکەیت لەسەر جەهمیەکان، پاشان هۆکاری بە جەهمیدانانی جەهمیەکان لەلایەن سەلەفەوە ڕوون ئەکەیتەوە، پاشان دێیت ئەیسەلمێنیت کە ئەشعەریە جەهمیەکان ملیم بە ملیم شوێن جەهمیە و موعتەزیلەکانی باوانیان کەوتوون، وە لە هەندێ بابەتیشدا سنووری باوانە کافرەکانیشیان تێپەڕاندووە، پاشان دێیت باسی ئیجماعی ئەهلی سوننە ئەکەیت لەسەر تەکفیرکردنی ئەشعەریە جەهمیەکان لەلایەن ئەهلی سوننەوە لە سەدەی سێ و چوار و پێنج و شەشی هیجری، کۆمەڵە دروستکراوێکی بێعەقڵ ئەڵێن : (یاعنی ئیمامی نەوەوی یش جەهمی ە؟) .

ئەمە هەموو قسە و بیرکردنەوەیەکیەتی لە بەرامبەر وتەی چەندین زانا لە سەلەف و خەلەف .

پاشان دێت ئەڵێت کاکە نەوەوی ئەشعەری نەبووە، بەڵام کەوتووەتە ناو هەندێ بیدعەی ئەشعەریەکانەوە .

زۆر باشە، قسەکەت تا سەر ئێسقان هەڵەیە، بەڵام با بڵێین لە چەند بابەتێکدا موافەقەی ئەشعەریەکانی کردووە، باشە بۆ پێی ئەڵێیت ئیمام؟ بۆ هیچ نەبێت تەبدیعی ناکەیت؟ بۆچی موەکانت گرژ ئەبێت کاتێک ئەهلی سوننەیەک باسی جەهمیەت و زەندیقیەتیەکانی ئەکات و تەکفیری ئەکات؟

نەوەوی نەک ئەشعەریەکی عەیارە بیست و چوارە، بەڵکو زۆر توندیشە لەسەر ئەشعەریەت، وە بە موو لە عەقیدەی ئەشعەریە جەهمیەکان لاینەداوە.

الذهبي (٧٤٨ هـ) لە (تاريخ الإسلام) ـدا ئەڵێت :

(نەوەوی (٦٧٦ هـ) لە عەقیدەدا ئەشعەریە و ناسراوە پێی، تەبدیعی ئەوانە ئەکات کە موخالەفەی ئەکەن، وە زیادەڕەوی دەکات لە توندبوون لەسەریان).

السبكي الأشعري الجهمي القبوري (٧٧١ هـ) لە کتێبی (طبقات الشافعية الكبرى) ـدا ئەڵێت :

(بارودۆخی هەندێک موجەسیمە لە سەردەمی ئێمەدا گەیشتووە بەوەی کە لە شەرحی شیخ النووي بۆ سەحیحی مسلم ئەو قسەیانەی بسڕنەوە کە کردوونی لەسەر فەرموودەکانی سیفات، چونکە النووي عەقیدەی ئەشعەریەکانی هەیە) .

النووي الأشعري الجهمي لە (تهذيب الأسماء واللغات) ـدا ئەڵێت :

(وە الأستاذ أبو إسحاق الإسفراييني یەکێک بوو لەو سێ کەسەی کە لە یەک سەردەمدا مەزهەبی ئەهلی حەدیث و سوننەیان لە بابەتە کەلامیەکاندا سەرخست، وە هەستان بە سەرخستنی مەزهەبی الشيخ أبو حسن الأشعري، ئەوانیش بریتی بوون لە : الأستاذ أبو إسحاق الإسفراييني، القاضي أبو بكر الباقلاني، وە الإمام أبو بكر إبن فورك) .

تەماشا بکە بە مەزهەبی ئەشعەریە جەهمیەکان ئەڵێت مەزهەبی ئەهلی حەدیث و سوننە !

وە لە چەندین شوێنی کتێبەکانەدا ئەڵێت : (هاوەڵە موتەکەلیمینەکانمان).

ئەگەر کەللە ڕەقی ئەکەیت و ئەڵێیت ئەشعەری نییە ئەوە بزانە لە بابەتی ئیمان و قەدەر و سیفات و النبوات و سەربڕین بۆ غەیری اللّٰه تعالی و تەبەروک بە پیاوچاکان و هەموو بابەتەکانی تردا سەد لە سەد ئەشعەریەکی جەهمی تۆخە، کەواتە چ بابەتێک مایەوە موافەقەی موسوڵمانانی تێیدا بکات ئەگەر لە هەموو بابەتەکانی عەقیدەدا ئەشعەریەکی جەهمی بێت؟

# خۆدانەپاڵی النووي الأشعري الجهمي بۆ لای ئەهلی کەلام

لەلای کەسانی نەزان و تێنەگەیشتوو لە دین هەر کەسێک خۆی دابێتە پاڵ مەزهەبێکی فیقهی دانێپێدانراو، وە کتێبی نووسیبێت لەوبارەیەوە و شارەزاییەکی هەبێت تیایدا ئەوە لە ئەهلی سوننە و حەدیث هەژمار ئەکرێت ئەگەرچی خاوەنی چەندین کوفر و بیدعەش بێت لە دیندا، بە بیانوی ئەوەی خزمەتی دینی کردووە .

بەڵام لەلای سەلەف بەو جۆرە نەبووە، ئەگەرچی کەسێک بانگەشەی ناسینی فەرموودەش بکات ئەگەر عەقیدەی جەهمیەکانی هەبووبێت ئەوە بە جەهمی و پەکخەر ناسێنراوە، بەڵکو ئەگەر تەنها بیدعەیەکی هەبووبێت وەکو عەقیدەی ئیرجاء ئەوە ڕیوایەتی لێ نەکراوە و بیدعەچی و گومڕا دانراوە .

ئیمام **عثمان بن سعيد الدارمي** (٢٨٠ هـ) رحمه الله دەربارەی فەرموودەکانی بینینی الله عز وجل لە بەهەشتدا ئەڵێت :

(هەموو ئەم فەرموودەیانە، وە زیاتر لەمانەش گێڕدراونەتەوە لە بابەتی بینینی الله عز وجل لە بەهەشتدا، لەسەر بەڕاستدانان و ئیمان هەبوون پێی گەیشتووین بە ئەهلی فیقھ و بەرچاوڕۆشنی لە شێخەکانمان، وە هەتا ئێستاش موسوڵمانان لە کۆن و نوێدا ئەیگێڕنەوە و باوەڕیان پێیەتی، وە ڕەتی ناکەنەوە، وە هەر کەسێک لە ئەهلی زەیغ ڕەتی بکاتەوە ئەیدەنە پاڵ گومڕایی، وە لە ناخی خۆیاندا گەورەترین ئاوات و باشترین پاداشتیان بریتی بووە لە تەماشاکردنی ڕووی دروستکەرەکەیان، بگرە هیچ شتێک لە نیعمەتەکانی بەهەشت یەکسان ناکەن پێی، **وە قسەم کرد لەگەڵ کەسێک لەو پەککەرانەدا، وە هەندێک فەرموودەم بۆ گێڕایەوە، وە لەو کەسانەبوو کە لە ڕووکەشدا خۆی بە فەرموودە ئەڕازاندەوە و بانگەشەی زانینی ئەکرد، جا ئینکاری لە هەندێکیان کرد و بە توندی ڕەتی کردەوە)** .

**النقض**

النووي الأشعري الجهمي ش لە نووسراوەکانیدا لە چەندین شوێندا عەقیدەی جەهمیەکانی هەیە لە بابەتی و ناو و سیفات، وە لە بابەتی قەدەر عەقیدەی جەبریەکانی هەیە، وە لە بابەتی ئیماندا عەقیدەی مورجیئەکانی هەیە، وە لە بابەتی تەبەروک و خورافیاتەکاندا عەقیدەی سۆفیە گێژەکانی

هەیە، وە لەلای ئەو موجەدیدی سەدەی چوارەم و پێنجەمی هیجری ئەشعەریە جەهمیە موتەکەلیمەکانن، وە لە چەندین شوێنی نووسراوەکانیدا خۆی ئەداتە پاڵ هاوەڵە موتەکەلیمینەکانی، وە عەقیدەی ئەهلی کەلام بە عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەزانێت، چ کەسێک ئەم هەیە لەلای سەلەف ئەم هەموو کوفر و گومڕاییەی تێدا کۆبوویێتەوە و سەلەف رحمهم الله بە جەهمی و پەکخەر و زندیق دایان نەنابێت؟ چجای بگات بەوەی لەمڕۆدا بە شەرمەوە بووترێت (ئەشعەری نییە بەس لە هەندێک شتدا موافەقەی ئەشعەریەکانی کردووە!) لەکاتێکدا ئەگەر بە پێوانەی سەلەف بیپێویت بەلایەنی کەمەوە جەهمیەکی پەکخەری و زەندیقی کافرە .

قال النووي **الأشعري الجهمي** في (**مجموع شرح المهذب : ١٤/٢**) :

(وَالرُّوحُ . . . مَذْهَبُ **أَصْحَابِنَا الْمُتَكَلِّمِينَ** أَنَّهَا أَجْسَامٌ لطِيفَةَ) .

وقال في (**شرح مسلم : ١٤٨/١**) :

(قال المحققون من **أصحابنا المتكلمين** نفس التصديق لا يزيد ولا ينقص) .

وقال في (**شرح مسلم : ١٥٠/١**) :

(فقالت طائفة لا يقول أنا مؤمن مقتصرا عليه بل يقول أنا مؤمن إن شاء الله وحكى هذا المذهب بعض أصحابنا عن أكثر **أصحابنا المتكلمين**).

قال في (شرح مسلم : ٦/٢٢٣) :

(وفيه دليل لمذهب **أصحابنا المتكلمين** ومن وافقهم أن الروح أجسام لطيفة متخللة في البدن) .

قال في (شرح مسلم : ١٦/١٠٨) :

(وفيه أن كرامات الأولياء قد تقع باختيارهم وطلبهم وهذا هو الصحيح عند **أصحابنا المتكلمين**) .

وقال في (تهذيب الأسماء واللغات : ٣/١٤٣) :

(يحرم على بعض أصحابنا المتكلمين من أن صفاته سبحانه وتعالى لا يقال هي الذات ولا غيرها) .

وقال في (تهذيب الأسماء واللغات : ٤/١٩٣) :

(قال إمام الحرمين وغيره من **أصحابنا المتكلمين** : التوفيق خلق قدرة الطاعة، والخذلان خلق قدرة المعصية .

قال : (الرزق) عِنْد **أَصْحَابِنَا الْمُتَكَلَّمين** وعند أهل اللغة كل ما انتفع به المنتفع) .

باسی موجەدیدەکانی ئەو دینە ئەکات کە خۆی لەسەریەتی و لە **(تهذیب الأسماء واللغات : ١٨/٢)** ئەڵێت :

(وفي الرابعة قيل : أبو سهل الصعلوكي، وقيل : القاضي ابن الباقلاني، وقيل : أبو حامد الإسفرايني، وفى الخامسة: الإمام أبو حامد الغزالي) .

چ کەسێک بێجگە ئەشعەریە جەهمیەکان ئەشعەریەکی جەهمی وەکو الغززالي و الباقلاني بە تازەکەرەوەی دینەکەی ئەزانێت؟

ئەوانە تازەکەرەوەی دین نین بەڵکو چەندین کوفر و شیرک و بیدعەیان هێنایە ناو دینەکە و بوون بە هۆکاری دارِمانی تەوحید و عەقیدەی سەلەف و ئەهلی سوننە .

موجەدید ئەوەیە کە لەناو ئەو کوفر و بیدعەیەدا تەوحید ی الله تعالى و سوننەتی رسول الله ﷺ لەسەر مەنهەجی سەلەف ئەژیەنێتەوە و دژی پێچەوانیکارانی ئەوەستێت و وەڵامیان ئەداتەوە و حوکمی شەرعیان لەسەر جێبەجێ ئەکات .

نەوەک وەکو ئەشعەریە جەهمیەکان دێن کۆمەڵە کوفر و شیرک و بیدعە و گومڕاییەکی تازە دێننە ناو دینەوە و جاهیلەکانیش پێیان ئەڵێن موجەدید! ئەوانە تازەکەرەوەی کوفر و شیرک و ئیلحادن، وە تا لەناوبەر و بگۆڕ و ڕوخێنەری و تەوحید و سوننەتن .

# النووي الأشعري الجهمي و عەقیدەی مورجیئەکان و بە فەرزدانانی فێربوونی جەهلی کەلام

- النووي **الأشعري الجهمي** لە **شرح مسلم (١٤٩/١)** ئەڵێت :

(زانایان لە سەلەف و بێجگە لەوانیش ڕاجیاوازن لەوەی کەسێک بڵێت : (من ئیماندارم)، کۆمەڵەیەکیان وتیان نابێت بڵێت (من ئیماندارم)، بەڵکو ئەڵێت (من ئیماندارم إن شاء الله)، وە هەندێ لە هاوەڵەکانمان ئەمەیان گێڕاوەتەوە لە زۆربەی هاوەڵە موتەکەلیمینەکانمانەوە، وە کۆمەڵەیەکی دیکەش ڕێگەیان داوە بەوەی نەڵێت (إن شاء الله)، ئەوەش هەڵبژێردراوە، وە وتەی ئەهلی تحقيق ە) .

النووي **الأشعري الجهمي** بێشەرمانە درۆ ئەکات بەدەمی سەلەف ەوە و ئەڵێت ڕاجیاواز بوون دەربارەی ئەوەی کەسێک بڵێت (من ئیماندارم)، یان (من ئیماندارم إن شاء الله)، وە لە کۆتایشدا ئەڵێت وتەی هەڵبژێردراو و ئەهلی تەحقیق ئەوەیە بوترێت (من ئیماندارم)، واتە ئیستثناء نەکرێت لە ئیماندا .

لەکاتێکدا عەقیدەی سەلەف و ئەهلی سوننە ئەوەیە ئیستثناء بکرێت لە ئیماندا .

- ئیمام **ابن بطة** رحمه الله (**٣٨٧** هـ) لە باسکردنی عەقیدەی ئەهلی سوننەدا ئەڵێت :

(پاشان جیاکاری کردن لە ئیماندا؛ ئەویش بەوە ئەبێت کە پیاو بڵێت : إن شاء الله .

عبدالله ی کوڕی مسعود رضي الله عنه هەر ئەوەی ئەوت .

وە زانایانی دوای خۆی ئاوها وەریانگرتووە، وەکو : علقمة، و الأسود، و ابي وائل، و مسروق، و منصور، و مغيرة، و ابراهيم النخعي، و الأعمش، و حماد بن زيد، و يزيد بن زريع، بشر بن المفضل، و معاذ بن معاذ، و سفيان بن حبيب، و سفيان الثوري، و ابن المبارك، و الفضيل بن العياض وە کۆمەڵێکی تر لە غەیری ئەمان کە بە باس کردنیان کتێبەکە درێژ دەبێتەوە .

**الإبانة الصغرى : ٢٤٤ و ٢٤٥**

ئەم کەسانەی کە إبن بطة ناوی هێنان هەموویان تابعی یان تابعی تابعی بوون جگە لە عبدالله ی کوڕی مەسعود کە هاوەڵی پێغەمبەرە ﷺ، جا لێرەوە دەرئەکەوێت کە زانایانی سەلەف بە بێ إن شاء الله واتە بە بێ جیاکاری نەیانوتووە ئیمانداریین .

- وە ئیمام **حرب الكرماني** رحمه الله (**٢٨٠** هـ) لە **(كتاب السنة)** دا کە ئیجماعی زانایانی ئەو سەردەمە و پێش خۆی نقڵ ئەکات ئەڵێت :

(وە ئەگەر کەسێک پرسیاری لێکرا ئایا ئیمانداره، بڵێت : ئیماندارم إن شاء الله) .

وە ڕوونی ئەکاتەوە وتەی (من ئیماندارم) وتەی مورجیئە گومڕاکانە وەک چۆن لە هەمان کتێبدا باسی عەقیدەی مورجیئەکان ئەکات و ئەڵێت :

(ئەڵێن : ئیمان ئیستثناء ی تێدا نییە، وە ئیمانداران لەلای الله بەبێ ئیستثناء، ئەمانە هەمووی وتەی مورجیئەکانە، وە لە پیسترین و گومڕاکەرترینی وتەکانە، وە دوورترینیانە لە هیدایەت) .

- وە ئیمام **الخلال** رحمه الله (**٣١١** هـ) لە **(كتاب السنة)** دا باب یێکی داناوە بەناوی (ڕەددانەوەی مورجیئەکان دەربارەی ئیستیثناء کردن لە ئیماندا) .

بەڵام النووي **الأشعري الجهمي** لەم بابەتەدا عەقیدەی مورجیئەکانی هەیە و سەری ئەخات و ئەڵێت : (کۆمەڵەیەکی دیکەش ڕێگەیان داوە بەوەی نەڵێت (إن شاء الله)، ئەوەش هەڵبژێردراوە، وە وتەی ئەهلی تحقیق ە) .

کەوابێت النووي **الأشعري الجهمي** عەقیدەی مورجیەکانی هەیە لەم بابەتە، ئەگەر لە هەموو شتێکدا موافەقەی ئەهلی سوننەشی کردبێت تەنها ئەمە بەسە بۆ تەبدیع کردنی، بەڵام سەرەڕای ئەوەی لە بابەتی ئەسماء و سیفات دا عەقیدەیەکی جەهمی پەکخەری عەیارە **٢٤** ی هەیە و لە بابەتی ئیمانیشدا عەقیدەی مورجیئەکانی هەیە لەلای گومڕا و گومڕاکەر و دڵکوێرەکان نەک کافر نییە بەڵکو ئیمامە!

وە تەماشا بکە ئەڵێت (هەندێ لە هاوەڵەکانمان ئەمەیان گێڕاوەتەوە لە زۆربەی هاوەڵە موتەکەلیمینەکانمانەوە) .

هەر کوفری کەلام بوو قوڕی کرد بە سەر خۆی و ئیمام و شوێنکەوتووانی و تووشی ئەم هەموو جەهمیەت و زەندەقەیەی کردن .

- النووي **الأشعري الجهمي** لە **مجموع شرح المهذب (٥١٩/٤)** ئەڵێت :

(لەو بیدعەیانەی فێربوونی واجبە بریتیە لە بەڵگە کەلامیەکان) پاشان ئەڵێت (فەرزی کیفایەیە) .

- لەلای النووي **الأشعري الجهمي** فێربوونی کەلام واجب و فەرزی کیفایەیە، بەڵام لەلای سەلەف هۆکاری هەموو کوفر و زەندەقەیەکە!

- ئیمام **مالك بن أنس** رحمه الله ئەڵێت :

(هەرکەسێک هەوڵی فێربوونی دین بدات بە کەلام زەندیق ئەبێت) .

**ذم الكلام وأهله : ٨٧٣**

- ئیمام **عبد الله بن المبارك** رحمه الله :

(هەرکەسێک کەلام وەربگرێ زەندیق ئەبێت) .

**الابانة الصغرى لابن بطة : ١٦٢**

- ئیمام **عبد الرحمن بن مهدي** رحمه الله ئەڵێت :

(هەرکەسێک هەوڵی فێربوونی کەلام بدات کۆتایی کارەکەی زەندەقە یە) .

**الحجة في بيان المحجة : ٢٣٦**

- رستە وتی : ووترا بە **عبد الرحمن بن مهدي** فڵان کەس کتێبێکی نوسیوە لە وەڵامی فڵان کەسدا .

وتی : وەڵامێک بە کتێبی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ ؟

ووترا : بە کەلام .

وتی : وەڵامی بەتاڵێکی داوەتەوە بە بەتاڵێک .

**حلية الأولياء**

- ئیمامی **الشافعي** رحمه الله ئەڵێت :

(جگە لە شیرک ئەگەر بەندە تووشی هەموو ئەو تاوانانە ببێت کە الله نەهی لێی کردوە باشترە لە کەلام، کە سەیری ئەو کەسانە ئەکەم خۆیان سەرقاڵ کردوە بە کەلام ئەو وتانەی ئەوان ئەیڵێن گومانم هەیە موسڵمان هەبێت و شتی وا بڵێت) .

**آداب ومناقب الشافعي لابن أبي حاتم**

- ئیمام **أحمد بن حنبل** رحمه الله ئەڵێت :

(هاوەڵی کەلام سەرفراز نابێت، هەرکەس کەلام وەربگرێ ئەمین نیە لەوەی کە نەبێتە جەهمی) .

**الرد على الجهمية**

- *إبن قتيبة* رحمه الله (**٢٧٦** ه) ئەڵێت :

(الكلام ئیشی ئێمە نییە، وە پێم وایە زۆربەی بەهیلاکچووەکان بەهیلاک نەچوون ئیللا بەهۆی الكلام ەوە نەبێت) .

**الإختلاف في اللفظ والرد على الجهمية**

- وە ئەڵێت : ڕەحمەتی الله ـت لێبێت من تێڕامام لە وتەی ئەهلی کەلام، جا بۆم دەرکەوت شتێک ئەڵێن لەسەر الله کە نایزانن، وە خەڵکی - واتە ئەهلی سوننە - عەیبدار ئەکەن بەوەی کە پێی هاتوون، وە خەڵکی تاوانبار ئەکەن بەوەی کە نقڵیان کردووە، بەڵام خۆیان تاوانبار ناکەن لەبەر ئەو تەئویلانەی کە ئەیکەن.

**تأويل مختلف الحديث**

# النووي الأشعري الجهمي و تەوەسول و تەبەروک کردن بە پیاوچاکانەوە

هەرکاتێک بینیت سۆفیە قەبرپەرستە گێژە خورافیەکان بیدعەیەک یان کوفرێک یان هەر جۆرێکی تری گومڕایی ئەنجام ئەدەن تەنها لۆمەی ئەوان مەکە و حوکمیان لەسەر مەدە، بەڵکو لۆمەی ئەو ئیمامەشیان بکە کە ئەو بیدعە یان کوفرەی بۆ شەرعاندوون و بە کافرێتی یان بیدعەچێتی حوکمی لەسەر بدە، النووي **الأشعري الجهمي** یەکێکە لەوانەی کە تەبەروک کردن بە پیاوچاکانەوە بە کارێکی جائیز و بگرە موستەحەببیش ئەزانێت :

- النووي **الأشعري الجهمي** لە **شرح صحيح مسلم (٢٤٤/١)** ئەڵێت :

(لەم فەرموودەدا تەبەروک بە ئاسەواری پیاوچاکانی تێدایە) .

وە لە **شرح صحيح مسلم (٥٥/١١)** دا ئەڵێت :

(تەبەروک بە ئاسەواری پیاوچاکانی تێدایە وەکو بەرماوەی خواردن و خواردنەوەیان) .

وە لە **شرح صحيح مسلم (١٩٤/٣)** دا ئەڵێت :

(تەبەروک بە پیاوچاکان و موستەحەببونی بردنی منداڵی تێدایە بۆ لای ئەهلی فەزڵ بۆ تەبەروک پێوەکردنیان) .

وە لە **شرح صحيح مسلم (٢١٩/٤)** دا ئەڵێت :

(تەبەروک بە شوێنەواری پیاوچاکان و بەکارهێنانی بەرماوەی ئاوی دەستنوێژ و خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگی تێدایە) .

وە لە **شرح صحيح مسلم (٣/٧)** دا ئەڵێت :

(تەبەروک کردن بە شوێنەوار و جلوبەرگی پیاوچاکانی تێدایە) .

وە لە چەند شوێنێکی تر باسی ئەکات بەڵام ئەوە بەسە .

**سليمان بن عبدالله** لە **(تيسير العزيز الحميد)** دا ئەڵێت :

(بەشێک لە موتەئەخیرین باسیان کردووە کە تەبەروک کردن بە ئاسەواری پیاوچاکانەوە موستەحەببە) دواتر ئەڵێت : (النووي لە شەرحی مسلم دا ئەوەی زۆر باس کردووە لەو فەرموودەیانەی کە هاوەڵان رضي الله عنهم کارێکی وایان کردووە لەگەڵ رسول الله ﷺ، وە النووي وا ئەزانێت پیاوچاکانی تریش لەودا وەکو رسول الله ﷺ وان وە ئەمەش هەڵەیەکی زۆر ڕوونە) .

لێرەدا فەهمسەقەتی و ناحاڵیبوون و گومڕایی النووي ـت بۆ دەرئەکەوێت، چونکە هاوەڵان رضي الله عنهم تەبەرووکیان تەنها بە رسول الله ـەوە ﷺ کردووە،

وە لەپاش ئەو تەبەروک نەکراوە بە هیچ شتێکی هیچ هاوەڵ و تابیعی و ئیمامێکی سەلەفەوە، چونکە تەبەروک کردن تایبەتە بە رسول الله ﷺ، بەڵام النووي الجهمي ئەو حەقە ئەدات بە هەر کەسێک خۆی بە پیاوچاکی بزانێت و قیاسی ئەکاتە سەر رسول الله ﷺ .

- ئیمامی **الخلال** رحمه الله ئەڵێت :

(علي بن عبدالصمد الطيالسي ئەڵێت : دەستم هێنا بە دەستی أحمد بن حنبل و پاشان دەستم هێنا بە خۆمدا، ئەویش تەماشای ئەکردم، جا زۆر توورە بوو و دەستی ڕاوەشاند و ئەیوت : (ئەمە لە کێتان وەرگرتووە؟!) وە زۆر ئینکاری و ڕێگری لێ کرد) .

**مناقب الإمام أحمد**

- النووي **الأشعري الجهمي** لە کتێبی **(الأذكار)** دا تەوەسولێکی بیدعی ئەکات و ئەڵێت :

(ئەی پەروەردگارم من داوات لێ ئەکەم بە حەقی پیاوچاکانت)، وە ئەڵێت : (پاشام ئەگەڕێتەوە بۆ شوێنی یەکەمی بەرامبەر رسول الله ﷺ و تەوەسولی پێوە ئەکات و بە حەق و جاهی داوا لە پەروەردگاری ئەکات) .

التوسل : طلب الوسيلة، واتە داواکردنی نزیکبوونەوە و شەفاعەت، بە مانایەکی تر واتە نزیکبوونەوە لە الله بە وەسیلە و ڕێگایەک .

- دوو جۆر تەوەسول هەیە، بەشێکی جائیز و شەرعیە کە بریتیە لە نزیکبوونەوە لە الله تعالی بە وەسیلەیەکی شەرعی .

بۆ نمونە :

١ - نزیک بوونەوە لە الله تعالی لە ڕێگەی ناو و سیفاتەکانی، واتە لە دوعاکانتدا بڵێیت یا الله لەبەر خاتری گەورەیی خۆت یان بۆخاتری ناوە جوانەکانت لە فڵانە کار یارمەتیم بدە .

٢ - نزیک بوونەوە لە الله تعالی لە ڕێگەی کار و کردەوەیەک کە لەپێناو ئەودا کردووتە، بۆ نمونە جارێک خۆت زۆر پێویستت بە پارە بووە بەڵام لەپێناو الله تعالی بەخشیوتە، لە دوعاکەتەدا ئەڵێیت یا الله لەبەر ئەو پارەیەی کە کردم بە خێر لە کاتێکدا خۆم زۆرم پێویست بوو فڵانە کارم بۆ ئاسان بکە .

٣ - نزیک بوونەوە لە الله تعالی لە ڕێگەی دوعاکردنی کەسێکی زیندوو و ئامادە بۆت، بۆ نمونە کەسێکی زۆر باش و لەخواترس و ئەهلی سوننە ئەناسیت و پێی ئەڵێیت دوعام بۆ بکە الله تعالی فڵانە شتم پێ بدات .

- دووەم جۆری تەوەسول کە یان بیدعەیە یاخود شیرک بریتیە لە هەوڵدان بۆ نزیکبوونەوە لە الله تعالی بەڕێگەیەک کە جائیز نییە .

إبن تيمية له (مجموع الفتاوى) ئەڵێت :

(ئەوەی کەسێک بڵێت داوات لێ ئەکەم بە حەق ی فلان و فلان، ئەوە **هەمووی لە بیدعە داهێنراوەکانە)** .

ئەوەی النووي **الأشعري الجهمي** ئەنجامی داوە یەکێکە لە بیدعە داهێنراوەکان .

# النووي الأشعري الجهمي و پەکخستنی سیفاتەکانی الله عز وجل بە تەحریفاتی جەهمیەکان و تەکفیرکردنی لەلایەن سەلەفەوە

سیفەتی (ید) دەست یەکێکە لەو سیفەتانەی کە ئەهلی سوننە و جەماعە وەکو سیفەتەکانی تر جێگیری ئەکەن بۆ اللّٰه تعالی بەبێ تەحریفکردن و دانانی چۆنیەتی و شوبهاندن، وە جەهمیە کافرەکانیش هەر لە سەردەمی سەلەفەوە بەوە ناسراون کە سیفەتی دەست تەحریف ئەکەن بە قووەت یان نیعمەت، لێرەدا وتەی سەلەف ئەهێنین لەسەر جەهمیەکان، وە قەولی بەناوزانایەکی ئەشعەری جەهمی ئەهێنینەوە کە لەگەڵ ابن حجر العسقلاني **الجهمي** بوون بە دوو بت لە بتەکانی ئەو محامیانەی کە اللّٰه تعالی دڵ و چاوی کوێر کردوون ڕاستیەکان بە هیچ شێوەیە کاریان تێ ناکات .

- النووي **الأشعري الجهمي** لە خیانەتە گەورەکەی بۆسەر سەحیحی ئیمام مسلم لە (٨٧/٨) لە تەفسیری ئایەتی : ﴿**بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ**﴾ (**المائدة** : ٦٤)

**ئەڵێت : واتە دوو نیعمەتەکەی، لەسەر ئەوەی تەئویلی دەست لێرەدا نیعمەتە.**

- ئیمام أبو سعید عثمان بن سعید الدارمي رحمه الله (**٢٨٠** هـ) ئەڵێت :

**(المریسي و هاوەڵانی بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە دەستی الله نیعمەتەکەیەتی) .**

**نقض عثمان بن سعید علی المریسي الجهمي العنید فیما افتری علی الله من التوحید**

- أبو بکر محمد بن إسحاق بن خزیمة (**٣١١** هـ) رحمه الله ئەڵێت:

**(جەهمیە پەکخەرەکان** وا گومانیان برد کە مانای ئەم ئایەتە : | بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ | **واتە دوو نیعمەتەکەی، ئەمە بریتیە لە گۆڕین (تبدیل) نەوەک تەئویل) .**

**کتاب التوحید وإثبات صفات الرب عز وجل**

- ئیمام **أبو عبدالله عبيدالله إبن بطة** رحمه الله (**٣٨٧** هـ) ئەڵێت:

**(جەهمیەکان وتیان و اتای دەست نیعمەتەکەیەتی)** .

**الإبانة الكبرى**

: وتەکەی النووي الأشعري الجهمي زۆر ڕوونە لە تەحریفکردنی ئایەتەکە بە تەحریفاتی جەهمیە پەکخەرە کافرەکان، وە وتەکانی سەلەفیش زۆر ڕوونترن لەوەی کە ڕوونکردنەوەیان بوویت .

# بەشێک

ئەشعەریە جەهمیەکان دوو ڕێگا بەکارئەهێنن بۆ پەکخستن و جێگیرنەکردنی سیفاتەکانی الله تعالی، یەکەم ڕێگا پێی ئەوترێت (تفویض)، تفویض واتە کەسێکی ئەشعەری جەهمی دێت و ئەڵێت : (لە قورئاندا هاتووە کە الله تعالی دوو دەستی هەیە، بەڵام نازانین دوو دەست یاعنی چی! وە هاتووە کە الله تعالی لەسەر عەرشە، بەڵام نازانین لەسەر عەرشە یاعنی چی!) جەهمیەکان بەم شێوەیە خۆیان لە جێگیرکردنی سیفاتەکانی الله تعالی ئەدزنەوە، وە هەندێک جار لەگەڵیشیدا ئەڵێن : (ڕووکەشەکەی مەبەست نییە!) واتە پوختەی قسەکەیان ئەوەیە کە ئەڵێن : (لە قورئان هاتووە کە الله تعالی لەسەر عەرشە، نازانین لەسەر عەرشە یاعنی چی، وە ڕووکەشی ئایەتەکەش مەبەست نییە!)

ئەشعەریە جەهمیەکان لەم وتەیەیاندا دوو کوفریان کردووە، یەکەمیان وتیان نازانین واتای ئەم سیفەتە چییە، دووەمیان وتیان ڕووکەشی ئەم سیفەتە مەبەست نییە، وە لەلای ئەشعەریە جەهمیەکان ئەمە عەقیدەی سەلەف بووە، هەر بۆیە کاتێک محامیەکانی ئەشعەریە جەهمیەکان ئەڵێن والله الجويني لە کۆتایی تەمەنیدا گەڕاوەتەوە بۆ عەقیدەی سەلەف! ئەهااا لە فلانە شوێن ئەڵێت گەڕاومەتەوە بۆ عەقیدەی سەلەف! ئێ گێژە تۆ ئەسڵەن ئەزانی

عەقیدەی سەلەف لەلای الجويني بریتیە لە تفویض؟! یان ئەڵێ الغززالي یان الرازي یان هەر کافرێکی تریان لە کۆتایی تەمەنیان پێنج دەقە پێش بەهیلاکچوونیان گەڕاونەتەوە بۆ عەقیدەی سەلەف، لەکاتێکدا عەقیدەی سەلەف لای ئەو ئەشعەریە زەندیقنانە بریتیە لە تفویض نەک ئیثباتکردنی سیفەتەکان .

بەڵکو ئیثبات کردنی سیفەتەکان لەلای ئەو کافرانە بریتیە لە عەقیدەی موشەبیهە و موجەسیمە ئیتر چۆن ئەگەڕێنەوە سەری؟ هەر بۆیە هەرکاتێک وترا ئەشعەریەکی جەهمی زەندیق گەڕاوەتەوە بۆ عەقیدەی سەلەف بڵێ کامە عەقیدەی سەلەف؟ ئیثباتکردنی ڕووکەشی ئایەت و فەرموودەکان؟ یان تفویض کردنی واتای ئایەت و فەرموودەکان؟ ئەگەر یەکەمیان بێت ئەوە الحمدلله، ئەگەر دووەمیشیان بێت ئەوە ئەشعەریە جەهمیەکە لە کوفرێک تۆبەی کردووە و چووەتەسەر کوفرێکی تر .

ڕێگەی دووەمی ئەشعەریە جەهمیەکان بۆ جێگیرنەکردن و پەکخستنی سیفاتەکانی الله تعالى بریتیە لە (تحریف)، واتە گۆڕینی واتای ڕاستەقینەی شتێک، بۆ نمونە ئەڵێن ڕاستە لە قورئاندا هاتووە کە الله تعالى دەستی هەیە، بەڵام دەست یاعنی قودرەت، یان نیعمەت .

جا رحمک الله بزانە هەردوو ئەم ڕێگایە لە ڕێگای جەهمیە زەندیقەکانن .

- النووي **الأشعري الجهمي** لە خیانەتە گەورەکەی بۆ سەحیحی ئیمام مسلم لە (٢٠٠/١٦) دەربارەی فەرموودەی (وخط لک بیده) ئەڵێت :

(لە باسکردنی دەست دا دوو مەزهەب هەیە کە پێشتر باسمان کرد، یەکەمیان بریتیە لە ئیمان هەبوون پێی و تەئویل نەکردنی و مەبەست نەبوونی ڕووکەشەکەی، وە مەزهەبی دووەمیش بریتیە لە تەئویل کردنی بەمانای قودرەت) .

ئەم فەرموودەیە باسی گفتوگۆیەک ئەکات کە لەنێوان پێغەمبەران آدم و موسی دا ڕوویداوە علیهم الصلاة والسلام، لە گفتوگۆگەدا آدم بە موسی ئەفەرمووێت : (وە بە دەستی خۆی بۆی نووسیت)، واتە الله تعالی بە دەستی خۆی تەوراتی بۆ پێغەمبەر موسی علیه السلام نووسیووە .

تەماشا بکە رحمک الله ئەو دوو ڕێگەیەی کە ئەم جەهمیە باسی ئەکات یەکەمیان بریتیە لە تفویض، ئەڵێت (ئیمان هەبوون پێی و تەئویل نەکردنی و مەبەست نەبوونی ڕووکەشەکەی)، لێرەدا سیفاتی دەست ی پەکخست و جێگیری نەکرد، چونکە ئەڵێت کە ڕووکەشی فەرموودەکە مەبەست نییە، واتا نابێت لەسەر ڕووکەش وەربگریت .

دووەم ڕێگەش بریتیە لە تەحریف کردن، وتی کە مانای دەست واتە قودرەت (هێز)، هەردوو ڕێگەکەش کوفر و زەندەقە و جەهمیەتن .

- قال الإمام الترمذي :

(وَقَدْ ذَكَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كِتَابِهِ اليَدَ وَالسَّمْعَ وَالبَصَرَ، فَتَأَوَّلَتِ الجَهْمِيَّةُ هَذِهِ الآيَاتِ فَفَسَّرُوهَا عَلَى غَيْرِ مَا فَسَّرَ أَهْلُ العِلْمِ، وَقَالُوا: إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَخْلُقْ آدَمَ بِيَدِهِ، وَقَالُوا: إِنَّ مَعْنَى اليَدِ هَاهُنَا القُوَّةُ)

ئیمام أبو عيسى الترمذي رحمه الله (٢٧٩ ھ) ئەڵێت :

الله عز وجل لە چەندین شوێنی قورئاندا باسی دەست و بینین و بیستنی کردووە، **وە جەهمیەکان تەئویلی ئایەتەکانیان کرد بە بەغەیری ئەوەی زانایان تەفسیریان کردووە، وە وتیان : الله ئادەمی بە دەستی دروستنەکردووە، وە وتیان : لێرەدا دەست بە مانای هێزدێت .**

**جامع أو سنن الترمذي**

- أبو بكر إبن خزيمة رحمه الله (٣١١ ھ) لە باسی تەحریف کردنی سیفەتی دەست بە هێز ئەڵێت :

**(هەندێ لە جەهمیەکان وا گومانیان برد کە (الله ئادەمی بە دەستەکانی دروست کرد) واتە بە هێزی، وا گومانیان برد کە دەست واتە هێز، وە ئەمە بریتیە لە گۆڕین، وە نەزانی وجەهلیشە بە زمانی عەرەب) .**

وە ئەڵێت : **(جێگیرکردنی دەستی الله جل ثناؤە لە فەرموودەی سەحیح لە پێغەمبەرەوە ﷺ بەوەی کە الله بە دەستی تەورات بۆ موسی نووسی کە قسەی لەگەڵ کردووە، وە لوتی جەهمیەکانیش بشکێت)** .

## کتاب التوحید وإثبات صفات الرب عز وجل

إبن خزیمة لە تەحریفکردنی دەست بە هێز ئەڵێت : (هەندێک لە جەهمیەکان)، چونکە بەشێکی تریان دەست تەحریف ئەکەن بە نیعمەت .

# النووي الأشعري الجهمي و نەفیکردنی ئەوەی الله عز وجل بە ذات ـی خۆی لەسەر عەرش بێت

حدث يحيي بن يحيي الليثي عن مالک بن أنس، عن هلال بن أسامة عن عطاء بن يسار، عن عمر بن الحكم أنه قال :

چوومە لای رسول الله ﷺ وتم : ئەی رسول الله، کەنیزەکێکم - کۆیلەی ئافرەت - مەڕەکانی بۆ دەلەوەڕاندم، کاتێک چووم بۆلای مەڕێک دیارنەمابوو، پرسیاری مەڕەکەم لێ کرد، وتی : «گورگ کوشتوویەتی» .

منیش پێم ناخۆش بوو، وە منیش مرۆڤم، زللەیەکم دا لە دەموچاوی لە کاتێکدا کۆیلەی منە، ئایا ئازادی بکەم؟

رسول الله ﷺ پرسیاری لە کەنیزەکەکە کرد : «الله لە کوێیە؟» .

وتی : «لە ئاسمانە - واتە لەسەر عەرش- »

پاشان فەرمووی : «من کێم؟»

وتی : تۆ پەیامبەری الله یت .

فەرمووی : «ئازادی بکە ئەمە ئیماندارە»

**موطأ لـ الإمام مالك بن أنس**

ئەم فەرموودە سەحیحە هەر لە کۆنەوە بووە بە دڕێکێک لە قوڕگی جەهمیەکانی هەموو سەردەمێکدا، چونکە ئافرەتێکی کۆیلەی دەشتەکی بە فیترەتی خۆی ئەزانێت کە الله عز وجل لە ئاسمانە، بەڵام جەهمیەکانی سەرەتا و ئەشعەریە جەهمیە زەندیقەکان بەهۆی دانانی بناغەی عەقیدە کوفریەکەیان لەسەر زبڵخانەی کەلام عەقیدەی هەموو پێغەمبەران و موسوڵمانان بە کوفر ئەزانن .

لەکاتێکدا کە کەنیزەکەکە وتی الله لە ئاسمانە، رسول الله ﷺ فەرمووی ئەمە ئازاد بکەن ئیماندارە، بەڵام ئەشعەریە جەهمیەکان ئەوە بە کوفر و تەشبیھ ئەزانن .

- النووي **الأشعري الجهمي** لەبارەی فەرموودەی جاریەکەوە لە خیانەتەکەی بۆ صحیح ی ئیمامی مسلم ئەڵێت :

(ئەمە لە فەرموودەکانی سیفاتە، وە لەبارەیەوە دوو مەزهەب هەیە کە پێشتر باسمان کردن) .

ئەو دوو مەزهەبەی کە النووي باسیان ئەکات و بە عەقیدەی ئەهلی سوننە جەماعەیان ئەزانێت دوو کوفری بێ خەوشن، هەردوو مەزهەبەکە

مەزهەبی جەهمیە یەکخەرەکانن، مەزهەکانیش بریتین لە (تفویض کردنی مانای سیفەتەکە)، وە (تەحریف کردنی مانای سیفاتەکە) .

- النووي الأشعري الجهمي باسی دوو مەزهەبەکە ئەکات و ئەڵێت :

(یەکەمیان : ئیمان هەبوون پێی بەبێ ئەوەی بزانین ماناکەی چییە .

دووەمیان : تەئویل کردنی) .

پاشان بەڵگە بە قاضي عیاض ی ئەشعەری جەهمی ئەهێنێتەوە و ئەڵێت:

(بێگومان هیچ ڕاجیاوازیەک نییە لە نێوان موسوڵمانەکاندا، بە فەقیہ و فەرموودەوان و موتەکەلیم و موقەلیدیانەوە کە ڕووکەشی ئەو نەصانای ئەڵێن الله لە ئاسمانە وەکو | أَأَمِنْتُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ أَنْ يَخْسِفَ بِكُمُ الْأَرْضَ | (**الملک** : ١٦)، وە هاوشێوەی ئەمە، ئەوە لەسەر ڕووکەش وەناگیرێن، بەڵکو لەلای هەموویان تەئویل ئەکرێت) .

قاضي عیاض ی الأشعري الجهمي زەندیق درۆی کرد، بەڵکو هەموو موسوڵمانان کۆکن لەسەر ئەوەی الله عز وجل لە ئاسمانە لەسەر عەرش، وە هەموو ئایەت و فەرموودەکانی سیفات لەسەر ڕووکەش وەرئەگیرێن، وە هەر کەسێک سیفەتەکە یەک بخات بە تفویض یان تەئویل (تەحریف) ئەوە جەهمیەکی زەندیقی دەرچووە لە ئیسلام .

وە سەلەف رحمهم الله ئەو کەسانەیان تەکفیر کردووە کە ئەوە جێگیر ناکەن الله عز وجل لەسەر عەرش بێت .

- ئیمام **یزید بن هارون** رحمه الله (**٢٠٦** هـ) ئەڵێت :

(هەر کەسێک وا گومان ببات | **الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ** | (**طه** : ٥) بە شێوەیەکە جیاواز لەوەی کە لە دڵی خەڵکیدا جێگیر بووە ئەوە جەهمیە) .

**السنة لـ عبدالله بن الإمام أحمد**

: ئەوەی لە دڵی موسوڵمانانندا جێگیر ئەبێت و بووە کاتێک ئایەتەکەیان خوێندووەتەوە بریتیە لە مانای ڕووکەشی ئایەتەکە .

- **وهب بن جرير** رحمه الله (**٢٠٦** هـ) ئەڵێت :

(جەهمیەکان زەندیقن، مەبەستیان ئەوەیە کە الله لەسەر عەرش بەرز نەبووەتەوە) .

- سعيد بن عامر الضبي رحمه الله (٢٠٨ ه) ئەڵێت :

(جەهمیەکان قسەکەیان خراپترە لە قسەی یەهود و نەسڕانیەکان، یەهودی و نەسڕانی و ئەهلی دینەکانی تر کۆڕان لەسەر ئەوەی الله تبارک و تعالی لەسەر عەرشە، وە جەهمیەکان وتیان لەسەر عەرش هیچی لێ نییە) .

خلق أفعال العباد لـ الإمام البخاري

- الكرجي القصاب رحمه الله ئەڵێت :

وتەی الله | وَلَهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَمَنْ عِنْدَهُ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ | (الأنبياء : ١٩) .

بەڵگەیە لەسەر موعتەزیلە و جەهمیەکان لەوەی کە ئەڵێن الله جل جلالە بە حەدی ذات وەسف ناکرێت، وە لەوەی کە ئەڵێن لەسەر عەرش نییە) .

النكت الدالة على البيان في أنواع العلوم والأحكام

ئەشعەریە جەهمیەکان نەک باوەڕیان نییە بەوەی کە الله عز وجل بە ذاتی خۆی لەسەر عەرش بێت، بەڵکو ئەو کەسانەش بە موشەبیهە و موجەسیمە و کافر ئەزانن کە خاوەنی ئەو عەقیدەیەن، لەکاتێکدا ئەوە عەقیدەیە هەموو پێغەمبەران علیهم السلام و سەلەفە رحمهم الله .

# النووي الأشعري الجهمي و نەفیکردنی حد بۆ الله عز وجل و تەکفیرکردنی موسوڵمانان

ئەهلی سوننە و جەماعە رحمهم الله لەبەر شوێنکەوتنیان بۆ وەحی بەپێی تێگەیشتنی سەلەف ئەڵێن الله عز وجل لەسەر عەرشە بە ذاتی خۆی، وە جیایە لە دروستکراوەکانی، وە سنوور (حد) ی هەیە، وە ئاگای لە هەموو شتێکە لە هەموو شوێنێک .

مەبەستیان لە سنوور (حد) ئەوەیە الله عز وجل تێکەڵی دروستکراوەکانی نییە، واتە لەسەر عەرشە و جیایە لە هەموو دروستکراوەکانی .

بەڵام جەهمیەکان و موعتەزیلەکان و ئەشعەری و ماتوریدیە جەهمیە زەندیقەکان بەهۆی پێشخستنی جەهلی کوفریی الکلام بەسەر قورئان و سوننەتدا باوەڕیان نییە بەوەی الله عز وجل لەسەر عەرشە بە ذاتی خۆی، بەڵکو ئەوە بە کوفر و تەشبیه و تەجسیم و زەندەقە ئەزانن لە کاتێکدا ئەوە عەقیدەی هەموو پێغەمبەرانە علیهم السلام، وە عەقیدەی هەموو هاوەڵان و تابیعین و سەلەف و موسوڵمانانە .

- ئیمام **عبدالله بن المبارك** رحمه الله ئەڵێت :

(پەروەردگارمان ئەناسین عز وجل بەوەی لەسەرووی حەوت تەبەقەی ئاسمانە لەسەر عەرش، جیایە لە دروستکراوەکانی و سنووری هەیە) .

**إثبات الحد لله عز وجل وبأنه قاعد وجالس على عرشه**

بگرە ئیمام **عثمان بن سعيد الدارمي** رحمه الله ئەڵێت :

(موسوڵمانان و کافران کۆدەنگن لەسەر ئەوەی الله تعالى لەسەرووی ئاسمانەوەیە، وە سنوور (حد) ی بۆ جێگیر ئەکەن، تەنها المريسي گومڕا و هاوەڵەکانی نەبێت، تەنانەت ئەو منداڵانەی کە نەگەشتوونەتە ئاستی پێگەشتن و باڵغ بوون ئەم شتە ئەزانن)

**نقض أبي سعيد عثمان بن سعيد على المريسي الجهمي العنيد في ما افترى على الله عز وجل من التوحيد**

- یەکێک لە شوێنکەوتووەکانی المريسي زەندیق کە بریتیە لە النووي **الأشعري الجهمي** نەفی (حد : سنوور) ی الله تعالى ئەکات لە خیانەتەکەی بۆ سەحیحی ئیمامی مسلم، لە بابەتی (الحجاب) دا کە ئەهلی سوننە ئەڵێن الله

عز وجل چەندین حیجاب (پەردە) ی لە نێوان خۆی و دروستکراوەکانیدا داناوە و جیایە لە دروستکراوەکانی و تێکەڵیان نەبووە، النووي ئەڵێت :

(الله تعالى پاکڕاگیراوە لەوەی حد ی هەبێت) .

النووي **الأشعري الجهمي** عەقیدەی کوفریی وایە کە الله لە هیچ شوێنێک نییە، وە بە ذاتی خۆی لەسەر عەرش نییە، هەربۆیە نەفی حد ئەکات .

- **يحيى بن عمار** رحمه الله ئەڵێت :

(إبن حبان هاتە لامان بۆ سجستان، نەفی حد ی الله عز وجل ی کرد ئێمەش لە سجستان وەدەرمان نا) .

**ذم الكلام وأهله**

**إبن تيمية** ئەڵێت :

(جەهمیەکان ئەیانوت الله حد ی نییە) .

**بيان تلبيس الجهمية في تأسيس بدعهم الكلامية**

وە هەر النووي **الأشعري الجهمي** لە کتێبی (روضة الطالبين) بەڵگە بە قسەی المتولي جەهمی ئەهێنێتەوە کە ئەڵێت :

(هەر کەسێک پێگەیشتن و جیابوونەوە (الإتصال والإنفصال) بۆ الله جێگیر بکات ئەوە کافرە) .

مەبەستی جەهمیەکان لە (الإنفصال : جیابوونەوە) بریتیە لە دانانی حد بۆ الله عز وجل، وە باوەڕبوون بەوەی لەسەر عەرشە و جیایە لە دروستکراوەکانی .

وە مەبەستیان لە (الإتصال : پێگەیشتن) بریتیە لە جێگیرکردنی ئەوەی الله عز وجل ئادەمی بە دەستەکانی دروست کردووە، وە تەوراتی بە دەستی نووسیوە، وە مەبەستیشیان لە نەفی کردنی دابەزینی الله تعالى یە لە سێیەکی شەودا.

لەم بابەتەدا ئەشعەریە جەهمیەکان بە دەستەواژەی ئاڵۆز و سەیر عەقیدە کوفریەکانی خۆیان دەرئەبڕن، بەڵام ئەگەر کەسێک شارەزای عەقیدەی کوفریەکەیان بێت ئەزانێت لە کوێوە قسە ئەکەن و مەبەست لە قسەکانیان چییە .

وەک چۆن ئیمامی تابیعی **عكرمة** رحمه الله ئەڵێت :

(الله عز وجل تەنها دەستی داوە لە سێ شت : ئادەمی دروستکرد بە دەستی، وە بەهەشتی ڕرواند بە دەستی، وە تەوراتی نووسی بە دەستی) .

**السنة لعبدالله بن الإمام أحمد**

الله عز وجل بە ڕاشکاوی بە ئیبلیس ئەفەرموویت : چی وای لێ کردیت سوجدە نەبەیت بۆ ئەوەی بە دەستەکانم دروستم کردوون؟ | **قَالَ يَا إِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَنْ تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ** | (ص : ٧٥) .

موسوڵمانان لەبەر شوێنکەوتنیان بۆ قورئان و فەرموودە و ئاثار عەقیدەیان وایە کە الله (ئەو شتانەی کە ئایەت و ئەثەرەکاندا هاتووە) بە دەستی خۆی ئەنجامی داون، بەڵام ئەشعەریە جەهمیەکان ئەڵێن الله پاکراگیراوە لەوەی الإتصال ی هەبێت، وە مەبەستیان نەفیکردن و پووچەڵ کردنەوەی ئەوەیە لە ئایەت و فەرموودە و ئاثارەکاندا هاتووە وەکو پیشەی هەمیشەییان، وە ئەسڵەن نەفی ئەوە ئەکەن الله عز وجل دەستی هەبێت چجای ئەوەی ئەو شتانە بە دەستی ئەنجام دابێت .

لە هەندێ وتەی سەلەفدا رحمهم الله نەفی حد ئەکەن لە سیفەتەکانی الله تعالى، کە ئەڵێن حد بۆ سیفەتی علیمی الله دانانێین مەبەستیان ئەوەیە ناڵێین

عیلمی الله ئەوەندە و ئەوەندەیە، وە کە ئەڵێن حد بۆ سیفەتی دەستی الله دانانێین مەبەستیان ئەوەیە ناڵێین دەستی بەو شێوەیە و بەو شێوەیەیە، لە هەمان کاتیشدا ئەڵێن الله عز وجل لەسەر عەرشە بە حد، واتە لەسەر عەرشە و لە دروستکراوەکانی جیاوازە، بۆیە باسی ئەمەم کرد هەتا هیچ گومڕا و گومڕاکەرێک نەیەت چەواشەکاری بکات لەو دەستەواژەیەی کە سەلەف بەکاریان هێناوە، لەگەڵ ئەو دەستەواژەیەی جەهمیەکانی سەرەتا و ئەشعەریە جەهمیەکان بەکاریان هێناوە .

# النووي الأشعري الجهمي و ڕەتکردنەوەی فەرموودە و جێگیر نەکردنی سیفەتی النزول

قال إبن أبي شيبة، حدثنا جرير، عن منصور، عن أبي إسحاق، عن الأغر أبي مسلم، يشهد على أبي هريرة، وأبي سعيد الخدري قال، رسول الله ﷺ فەرمووی :

(اللّٰه چاوەڕێ ئەکات هەتا سێ بەشی شەو تێئەپەڕێت، پاشان دائەبەزێتە ئاسمانی دنیا و ئەفەرموێت « ئایا کەس هەیە داوای لێخۆشبوون بکات؟

ئایا کەس هەیە تۆبە بکات؟

ئایا کەس هەیە دوعا بکات؟

ئایا کەس هەیە داواکاری هەبێت؟ » هەتا خۆر هەڵدێت) .

**المصنف لـ إبن أبي شيبة**

سەلەف رحمهم اللّٰه باوەڕیان وابووە کە اللّٰه تعالی لە کۆتا سێیەکی شەودا دائەبەزێتە ئاسمان دنیا، وە لە کتێبەکانیاندا ئەم فەرموودەیەیان هێناوە،

تەنانەت لە نزیکەی **٣٠** کتێبی سەلەفدا ئەم فەرموودەیە بە سەنەد و مەتنی جیاواز هاتووە.

ئیمام **الدارمي** رحمه الله لە **(الرد على الجهمية)** دا ئەڵێت : (ئەم فەرموودەیانەی کە دەربارەی هاتنەخوارەوەی الله عز وجل هاتووە هەموویان یان زۆربەیان لەم شوێنانەدا هاتوون، وە گەیشتووین بە ئەهلی فیقهـ و بەسیرەت لەسەر بەڕاستدانان و ئیمان پێهێنانی، هیچکامیان ڕەتیان نەکردووەتەوە، وە ڕێگریان نەکردووە لە ڕیوایەت کردنی هەتا ئەم کۆمەڵەیە دەرکەوتن و فەرموودەکانی رسول الله یان ﷺ ڕەتکردەوە، وە هەموو هەوڵی خۆیان خستەگەڕ بۆ بەدرۆخستنەوەی، وتیان : هاتنەخوارەوەکەی چۆنە؟

ئێمەش ئەڵێین : لە دینەکەماندا زانینی لە هاتنەخوارەوەکەی لەسەرمان دانەنراوە، وە دڵمان درکی پێ ناکات، وە الله عز وجل هیچ هاوشێوەیەکی نییە هەتا سیفەتێک یان کردەوەیەکی بچوێنین بە سیفەت و کردەوەکانیان).

**إبن خزيمة** رحمه الله لە **(كتاب التوحيد)** دا ئەڵێت : (دەروازەی باسکردنی ئەو فەرموودە سەنەد صحیح انەی زانایانی عێراق و حیجاز گێڕاویانەتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەربارەی هاتنەخوارەوەی الله جل و علا بۆ

ئاسمانی دنیا هەموو شەوێک، شایەتی ئەدەین بە شایەتیدانێکی دانپێدانراو بە زمان، وە بەڕاستخراوە بە دڵ، وە بە شایەتیدانێکی دڵنیایی لەبارەی ئەم فەرموودەیانەوە دەربارەی هاتنەخوارەوەی پەروەردگار بەبێ ئەوەی باسی و وەسفی چۆنیەتی دابەزینەکەی بکەین، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری هەڵبژێردراومان ﷺ وەسفی چۆنیەتی هاتنەخوارەوەی پەروەردگارمانی بۆ ئاسمانی دنیا نەکردووە، وە زانیاری پێداوین کە دێتە خوارەوە، وە الله جل و علا پێغەمبەری ﷺ ناردووە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی موسوڵمانان پێویستیانە لە بارەی دینەکەیانەوە، هەربۆیە ئێمە باوەڕمان بەوە هەیە کە لەم فەرموودانەدا هاتووە دەربارەی هاتنەخوارەوە، وە زۆر لە خۆمان ناکەین و وەسفی چۆنیەتیەکەی بکەین، چونکە رسول الله ﷺ باسی چۆنیەتیەکەی نەکردووە) .

**أبو عثمان الصابوني** ئەڵێت :

حەدیث ی : (الله تعالى لە سێیەکی کۆتایی شەودا دادەبەزێتە ئاسمانی دنیا) لە چەندین ڕێگاوە هاتووە، ئەمانە بەشێکن :

١ - لە الأوزاعي لە يحيي بن أبي كثير لە أبي سلمة لە أبي هريرة .

٢ - لە مالک بن أنس لە الزهري لە الأغر و أبي سلمة لە أبي هريرة .

٣ - لە يزيد بن هارون لە محمد بن عمرو لە أبي سلمة لە أبي هريرة .

٤ - لە مالک لە الزهري لە الأعرج لە أبي هريرة .

٥ - لە مالک لە الزهري لە سعيد بن المسيب لە أبي هريرة .

٦ - لە عبد الأعلى بن أبي المساور و بشير بن أبي سلمان لە أبي حانم لە أبي هريرة .

٧ - لە نافع بن جبير بن مطعم لە باوکيەوە .

٨ - لە موسى بن عقبة لە إسحاق بن يحيي لە عبادة بن الصامت .

٩ - لە عبدالرحمن بن كعب بن مالک لە جابر بن عبدالله .

١٠ - لە عبيدالله بن أبي رافع لە علي بن أبي طالب .

١١ - لە شريک لە أبي إسحاق لە أبي الأحوص لە عبدالله بن مسعود .

١٢ - لە محمد بن كعب بن فضالة بن عبيد لە أبي الدرداء .

١٣ - لە سعيد بن جبير لە إبن عباس .

### عقيدة السلف وأصحاب الحديث

ئەم فەرموودەیە دژ و هەڵوەشێنەرەوەی عەقیدەی کەلامی کوفری جەهمیەکان و ئەشعەریە جەهمیەکانی پاش خۆیانە، بە هیچ شێوەیەک ناتوانن وا لە خۆیان بکەن باوەڕیان بەم فەرموودەیە هەبێت تەنها لە ڕێگەی گۆڕینی

مانای فەرموودەکە و باوەڕ بوون بەو مانایەی کە خۆیان دایانتاشیوە بۆ فەرموودەکە لەسەر بناغەی عەقیدەی کەلامیە کوفریەکەیان .

ئیمام نعیم بن حماد رحمه الله ئەڵێت :

**(فەرموودەی النزول ڕەددی جەهمیەکان ئەداتەوە)** .

التمهید

ئیمام إبن بطة رحمه الله ئەڵێت :

**(ئەگەر بەڵگە چەسپا لەسەر جەهمی زانی کە ئەم فەرموودەیانە سەحیحە و نەیتوانی ڕەتی بکاتەوە**، ئەوە ئەڵێت : فەرموودەکە سەحیحە، وە مانای (پەروەردگارمان هەموو شەوێک دائەبەزێت) واتە فەرمانی دائەبەزێت) .

الإبانة الكبرى

جەهمیەکان لە کۆن و نوێدا نەیانتوانیوە لەڕووی سەنەد و زانستی فەرموودەوە ئەم فەرموودەیە بە لاواز دابنێن، هەر بۆیە دێن مانای فەرموودەکە ئەگۆڕن و تەئویلی ئەکەن، باوەڕ بەو واتا گۆڕاوە ئەهێنن کە خۆیان بۆ فەرموودەکەیان داناوە، واتە باوەڕیان بە مانای ڕاستی فەرموودەکە نییە، بەڵکو

باوەڕیان بەو مانایە هەیە کە خۆیان لەسەر عەقیدە کوفریەکەیان بۆ فەرموودەکەیان دارِشتووە.

- النووي **الأشعري الجهمي** لە (المجموع شرح المهذب : ٤٧/٤) باسی فەرموودەی النزول ئەکات، وە ئەڵێت :

(لە صحيح ى البخاري و مسلم دا هاتووە).

پاشان ئەڵێت : (دەربارەی ئەم فەرموودەیە دوو مەزهەبی بەناوبانگ هەیە، یەکەمیان : تەئویل کردنی).

پاشان باسی دووەم مەزهەب ئەکات ئەڵێت :

(نازانین واتای سیفەتەکە چییە، وە عەقیدەمان وایە کە **ڕووکەشەکەی مەبەست نییە**).

ئەو دوو مەزهەبەی النووي باسیان ئەکات مەزهەبی جەهمیەکانن، موسوڵمانان خۆیان بەدووڕاگرتووە لە هەردوو مەزهەبەکە، وە هەر کەسێک لەسەر ئەو دوو مەزهەبە بوویێت تەکفیریان کردووە.

پاشان رحمک الله تەماشا بکە و بزانە جەهمیەتی النووي لێرەدا زۆر ڕوونە، چونکە لە باسی مەزهەبی دووەمدا ئەڵێت :

(نازانین واتای سیفەتەکە چییە، وە عەقیدەمان وایە کە **ڕووکەشەکەی مەبەست نییە**) .

النووي مانای حەقیقی فەرموودەکە جێگیر ناکات، وە ئەڵێت نازانین واتای سیفەتەکە چییە، پاشان هەر خۆشی ئەڵێت کە ڕووکەشی فەرموودەکە مەبەست نییە !!

تۆ کە نازانیت واتای فەرموودەکە چییە بۆچی دێیت ئەڵێیت ڕووکەشەکەی مەبەست نییە؟

بێگومان ڕووکەشەکەیت بەلاوە کوفر و شیرک و تەشبیهە، بەڵام ناتوانیت ڕاستەوخۆ جەهمیەتەکەت دەربڕیت .

لە خیانەتەکەی بۆ سەحیحی ئیمامی مسلم (٣٦/٦) هەمان کوفر لەوێش دووبارە ئەکاتەوە .

# النووي الأشعري الجهمي و تەحریف کردنی سیفەتەکان بە تەحریفاتی جەهمیەکان

ورد ببەرەوە لە قسەی ئەم ئیمامە بەڕێزانەی سەلەف و بزانە دەربارەی تەحریفکردنی جەهمیەکان چی ئەڵێن :

- قال الإمام الترمذي :

(وَقَدْ ذَكَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كِتَابِهِ اليَدَ وَالسَّمْعَ وَالبَصَرَ، فَتَأَوَّلَتِ الجَهْمِيَّةُ هَذِهِ الآيَاتِ فَفَسَّرُوهَا عَلَى غَيْرِ مَا فَسَّرَ أَهْلُ العِلْمِ، وَقَالُوا : إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَخْلُقْ آدَمَ بِيَدِهِ، وَقَالُوا : إِنَّ مَعْنَى اليَدِ هَاهُنَا القُوَّةُ) .

ئیمام أبو عيسى الترمذي رحمه الله (٢٧٩ هـ) ئەڵێت :

(الله عز وجل لە چەندین شوێنی قورئاندا باسی دەست و بینین و بیستنی کردووە، وە **جەهمیەکان تەئویلی ئایەتەکانیان** کرد بە بەغەیری ئەوەی زانایان تەفسیریان کردووە، وە وتیان : الله ئادەمی بە دەستی دروستنەکردووە، وە وتیان : **لێرەدا دەست بە مانای هێز دێت** .

**جامع أو سنن الترمذي**

- **أبو بكر إبن خزيمة** رحمه الله (**٣١١** ه) له باسی تەحریف کردنی سیفەتی دەست بە هێز ئەڵێت :

(هەندێ لە جەهمیەکان وا گومانیان برد کە (الله ئادەمی بە دەستەکانی دروست کرد) واتە بە هێزی، وا گومانیان برد کە دەست واتە هێز، وە ئەمە بریتیە لە گۆڕین، وە نەزانی و جەهلیشە بە زمانی عەرەب) .

وە ئەڵێت : (جێگیر کردنی دەستی الله جل ثناؤه لە فەرموودەی صحيح لە پێغەمبەرەوە ﷺ بەوەی کە الله بە دەستی تەوراتی بۆ موسی نووسی کە قسەی لەگەڵ کردووە، وە لوتی جەهمیەکانیش بشکێت) .

**كتاب التوحيد وإثبات صفات الرب عز وجل**

إبن خزيمة لە تەحریفکردنی دەست بە هێز ئەڵێت : (هەندێک لە جەهمیەکان)، چونکە بەشێکی تریان دەست تەحریف ئەکەن بە نیعمەت .

- ئیمام **أبو سعيد عثمان بن سعيد الدارمي** رحمه الله (**٢٨٠** ه) ئەڵێت :

(المريسي و هاوەڵانی بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە دەستی الله نیعمەتەکەیەتی) .

**نقض عثمان بن سعيد على المريسي الجهمي العنيد فيما افترى على الله من التوحيد**

- أبو بكر محمد بن إسحاق بن خزيمة رحمه الله (٣١١ هـ) ئەڵێت :

(جەهمیە پەکخەرەکان وا گومانیان برد کە مانای ئەم ئایەتە : | بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ | واتە دوو نیعمەتەکەی، ئەمە بریتیە لە گۆڕین (تبديل) نەوەک تەئویل) .

**كتاب التوحيد وإثبات صفات الرب عز وجل**

- ئیمام أبو عبدالله عبيدالله إبن بطة رحمه الله (٣٨٧ هـ) ئەڵێت:

(جەهمیەکان وتیان واتای دەست نیعمەتەکەیەتی) .

**الإبانة الكبرى**

پاشان تەماشا بکە و ببینە النووي هەمان ڕێچگەی جەهمیە کافرەکانی گرتووەتەبەر، بەڵکو یەکێکە لەوان .

- النووي **الأشعري الجهمي** لە خیانەتەکەی بۆ صحيح ی ئیمامی مسلم (١٣٣/١٧) دا فەرموودەی (يطوي الله السماوات يوم القيامة ثم يأخذهن بيده اليمنى . . . هەتا کۆتایی فەرموودەکە) ئەڵێت :

(ئەگەر باسی دەست بۆ الله کرا، ئەوە دەستەکە تەئویل ئەکرێت بە هێز) .

وە پاشان وتەی القاضي عياض ئیمامی جەهمی ئەهێنێتەوە کە ئەڵێت : (ئێمە الله بەرز و پاک ڕائەگرین لە مانای ڕووکەشی ئەم فەرموودەیە) .

بزانە رحمك الله ئەم ئەشعەریە جەهمیانە ئایەتەکانی الله عز وجل و فەرموودەکانی رسول الله ﷺ بە کوفر و شیرک ئەزانن، هەربۆیە عیاض ی جەهمی ئەڵێت : (ئێمە الله بەرز و پاک ڕائەگرین **لە مانای ڕووکەشی ئەم فەرموودەیە)** .

بۆ الله تعالى نەیزانی نابێت بەو شێوەیە وەسفی خۆی بکات لە قورئانەکەی؟ بۆ رسول الله ﷺ نەیزانی کە نابێت بەو شێوەیە وەسفی الله تعالى بکرێت؟ یان ئێوەن جەهلی کەلام و فەلسەفەی یۆنانتان پێش خستووە بەسەر قورئان و فەرموودەدا و تووشی خراپترین کوفر بوو؟

- النووي **الأشعري الجهمي** لە خیانەتە گەورەکەی بۆ صحیح ی ئیمامی مسلم (٨٠/٧) سیفەتی دەستی ڕاست بۆ الله عز وجل جێگیر ناکات و بەڵگە بە قسەی المازري جەهمی ئەهێنێتەوە کە ئەڵێت : (فەرموودەی ' یمین الله ملأی سحاء، لا یغیضها شیء اللیل والنهار '، قاضي عیاض ئەڵێت : المازري وتی : ئەمە ئەبێت تەئویل بکرێت) .

پاشان المازري دێت هۆکاری تەئویل کردنەکە ئەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی فەرموودەکە ئەگەر وا وەری بگریت و تەئویلی نەکەیت ئەوە تەجسیمە !

تەجسیمیش لای ئەوان کوفرە !

وە پاشان لەوە خراپتریش ئەڵێت، المازري جەهمی ئەڵێت : (بەڵام رسول الله هێندەی ئاستی تێگەیشتنی هاوەڵان قسەی لەگەڵ کردوون ! ) .

واتە رسول الله ﷺ ئەم فەرموودەیانەی هەر ئاوا بە هاوەڵان وتووە و نەهاتووە بەم شێوەیەی ئەو جەهمیانە تەئویلی بکات لەبەر ئەوەی ئاستی تێگەیشتنی هاوەڵان ئەوەندە کەم بووە بەو شێوەیە قسەی لەگەڵ کردوون .

بەم شێوەیە ئەڵێن کە هاوەڵان رضي الله عنهم جاهیل و تێنەگەیشتوو بوون، هەر وەک چۆن عز بن عبدالسلام ی جەهمی دانی پێدا ئەنێت لە کتێبی قواعد الأحکام (https://t.me/imamakany_kufr/82) .

لەعنەتی الله و تەواوی لەعنەتکاران برژێت بەسەر خۆتان و شوێنکەوتوو و بەرگریکارانتاندا کە وا ئەزانن هاوەڵان رضي الله عنهم لە بابەتی ئەسماء و سیفات تێنەگەیشتوون و نەیزانیوە ئەوەی ئەیپەرستن خاوەن چ سیفەتێکە .

- النووي **الأشعري الجهمي** لە خیانەتەکەی بۆ صحیح ی ئیمامی مسلم (٣٩/٦) دا فەرموودەی (یبسط یدیه سبحانه و تعالى) تەحریف ئەکات بە تەحریفاتی جەهمیەکان .

- **النووي الأشعري الجهمي** لە خیانەتەکەی بۆ صحیح ی ئیمامی مسلم (٧٥/١٧) دا فەرموودەی (إن الله عز وجل یبسط یده باللیل لیتوب مسيء النهار، ویبسط یده بالنهار . . . تا کۆتایی) دووبارە و دەبارە تەحریفی ئەکات بە تەحریفاتی جەهمیەکان، مانای الید (دەست) تەحریف ئەکات، وە بەڵگە بە قسەی المازري جەهمی ئیمامی ئەهێنێتەوە .

پاشان النووي **الأشعري الجهمي** جەهمیەتی خۆی زیاتر دەرئەخات و لە خیانەتە گەورەکەی بۆ صحیح ی ئیمامی مسلم (٢١١/١٢) دا ئەڵێت : (فەرموودەی 'عن یمین الرحمن ' لە فەرموودەکانی سیفاتە، پێشتر باسمان کرد کە زانایان دوو بۆچوونیان هەیە دەربارەی، هەیانە ئەڵێت : ئیمانی پێ ئەهێنین، بەڵام قسە لە تەفسیرەکەیدا ناکەین وە نازانین واتای چییە، وە باوەڕمان وایە

کە ڕووکەشەکەی مەبەست نییە . . . پاشان باسی بۆچوونی دووەم ئەکات و ئەڵێت : تەئویل ئەکرێت) .

ئەو دوو بۆچوونەی النووي لێرەدا باسیان ئەکات هەردووکیان عەقیدەی جەهمیە کافرە زەندیقەکانن .

وە عەقیدەی سەلەف رحمهم الله بریتیبووە لە قبووڵ کردنی مانای ڕووکەشی فەرموودەکە و زانیویانە فەرموودەکە مانای چییە، وە دانانی هەر سیفەتێک کە الله عز وجل خۆی و لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ جێگیریان کردووە .

# النووي الأشعري الجهمي و تەحریفکردنی فەرموودەکان بە تەحریفاتی جەهمیەکان

- رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (إِذَا قَاتَلَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيَجْتَنِبِ الْوَجْهَ، فَإِنَّ اللَّهَ خَلَقَ آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ) .

**صحيح مسلم**

واتە : (ئەگەر یەکێکتان شەڕی لەگەڵ براکەی کرد با دووربکەوێتەوە - لە لێدان لە - ڕووخسار، چونکە الله ئادەمی لەسەر وێنەی خۆی دروست کردووە) .

- رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (لَا تُقَبِّحُوا الْوَجْهَ فَإِنَّ اللَّهَ عزوجل خَلَقَ آدَمَ عَلَى صُورَةِ الرَّحْمَنِ) .

**السنة لـ عبدالله**

واتە : (ناشرینی مەدەنە پاڵ ڕووخسار، چونکە الله عز وجل ئادەمی لەسەر وێنەی الرحمن دروست کردووە) .

لەم دوو فەرموودەیە سەحیح ـەی رسول الله وە ﷺ تێئەگەین کە الله تعالی سیفەتی صورة ی هەیە، وە ئادەمی علیه السلام لەسەر وێنەی خۆی، واتە وێنەی الله دروست کردووە .

سەلەف رحمهم الله تعالى باوەڕیان بەوە هەیە کە الله تعالى ئادەمی لەسەر وێنەی خۆی دروست کردووە، وە سیفەتی وجه و صورة بۆ الله جێگیر ئەکەن و فەرموودەکە وەکو خۆی وەرئەگرن، وە تەحریفی ناکەن وەکو جەهمیەکان .

جەهمیەکان لە کۆن و نوێدا باوەڕیان نییە بەوەی الله عز جل سیفەتی وجه و صورة ی هەبێت، چجای بگات بەوەی ئادەمی لەسەر وێنەی خۆی دروست کردبێت .

- الکوسج رحمه الله ئەڵێت : (دەربارەی ئەم فەرموودەیە ' لَا تُقَبِّحُوا الْوَجْهَ فَإِنَّ اللَّهَ عزوجل خَلَقَ آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ ' لە أحمد کرد .

أحمد وتی : صحیح ە .

إسحاق وتی : صحیح ە) .

**السنة لـ الخلال**

لە ڕووی سەنەد و مەتنەوە فەرموودەکە لە ئەوپەڕی صحیح بووندایە، وە چەندین ئیمامی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەم فەرموودەیانەیان لە کتێبە عەقیدەییەکاندا هێناوە، وە موخالیفەکانیان بە جەهمی و زەندیق داناوە .

- ئیمام حرب الكرماني رحمه الله ئەڵێت : (گوێم لە إسحاق بن راهويه بوو وتی : ' جێگیر بووە بە صحیح ی لە رسول الله ەوە ﷺ کە فەرموویەتی : ' الله ئادەمی لەسەر شێوەی الرحمن دروست کردووە ' ، وە پێویستە لەسەر پیاو ئەوە بڵێ کە جێگیر بووە لە پێغەمبەر ﷺ بە صحیح ی ' ) .

**السنة لـ الخلال**

وە لە ڕووی مانەوە سەلەف رحمهم الله فەرموودەکەیان لەسەر ڕووکەش وەرگرتووە، وە باوەڕیان وابووە الله تعالى ئادەمی لەسەر وێنەی خۆی - الله تعالى - دروست کردووە .

وە هەر کەسێک تەحریفی واتای فەرموودەکەی کردبێت و مانا ڕووکەشەکەی گۆڕی بێت بە جەهمی دایانناوە :

- بۆ أحمد بن حنبل باس کرا کە پیاوێک ئەڵێت ' خَلَقَهُ عَلَى صُورَتِهِ، واتە لەسەر وێنەی قوڕ ' .

أحمد وتی : (ئەمە قسەی جەهمیەکانە) .

**الإبانة الكبرى**

- أبو طالب رحمه الله ئەڵێت : (بیستم أبو عبدالله ئەیوت : ' هەر کەسێک بڵێت الله ئادەمی لەسەر وێنەی ئادەم دروست کردووە ئەوە جەهمیە، بۆ چ وێنەیەکی هەبوو گا ئادەمی لەسەر دروست بکات پێش دروست کردنی؟ ' ) .

**السنة لـ الخلال**

- إبن تيمية ئەڵێت : (لەناو سەلەفدا هیچ خیلافێک نەبوو لە هەر سێ سەدەکە لە جێناوی وشەی (صورَتِهِ) ئەگەڕێتەوە بۆ اللە، وە لە چەندین ڕێگاوە هاتووە لە چەندین هاوەڵەوە، وە سیاقی فەرموودەکان هەموویان بەڵگەن لەسەری)

وە ئەڵێت : (کاتێک جەهمیەکان دەرکەوتن لە سەدەی سێیەمدا، جێناوەکەیان گەڕاندەوە بۆ غەیری اللە تعالی) .

**بيان تلبيس الجهمية في تأسيس بدعهم الكلامية**

واتە جێناوی (هاء = ه) ی کۆتایی وشەی (صورَتِهِ) ئەگەڕێتەوە بۆ اللە، بەڵام جەهمیەکان جارێک ئەیگەڕێننەوە بۆ پیاو، جارێک بۆ قوڕ، یان بۆ هەر شتێکی تر تا خۆیان لە مانای حەقیقی فەرموودەکە بدزنەوە و خۆیان تووشی کوفر بکەن .

- النووي **الأشعري الجهمي** لە (شرح صحيح مسلم - ١٦٦/١٦) دا وەکو پیشەی هەمیشەیی خۆی و ئیمام و شوێنکەوتووە جەهمیەکانی لەسەر بناغەی جەهلی الکلام دێت تەحریفی واتای فەرموودەکە ئەکات، چونکە لەڕاستیدا پێی

وایە ئەم فەرموودەیە کوفرە، نابێت مانای ڕووکەشەکەی وەربگیرێت، بۆ هەڵهاتن لەمەش یان ئەبێت بووترێت هەر نازانین فەرموودەکە واتای چییە! یان بە تەحریفاتێکی جەهمیەکان تەحریفی بکات .

ئەڵێت : (فەرموودەی پێغەمبەر : (اللّٰه ئادەمی لەسەر وێنەی خۆی دروست کردووە) لە فەرموودەکانی سیفاتە، زانا هەیە تەئویلی ناکات و ئەڵێت : ' ئەزانین کە حەقە، وە باوەڕی پێ ئەهێنین، وە مانای ڕووکەشەکەی مەبەست نییە ' .

وە ڕێگەی دووەم بریتیە لە تەئویل کردنی .

پاشان ئەڵێت : المازري ئەڵێت : إبن قتيبة هەڵەی کردووە لە وەرگرتنی ئەم فەرموودەیە لەسەر ڕووکەشەکەی) .

ئەشعەریە جەهمیەکان مانای ڕووکەشی فەرموودەکە بە کوفر و زەندەقە ئەزانن، هەر لەبەر ئەوەشە تەحریفی واتاکەی ئەکەن، وە کاتێک ئەڵێن (ئەزانین کە حەقە، وە باوەڕی پێ ئەهێنین، وە مانای ڕووکەشەکەی مەبەست نییە) ئەوە واتای فەرموودەکەیان ڕەتکردووەتەوە .

# النووي الأشعري الجهمي و بەتاڵکردنەوەی بینینی الله تعالی لە قیامەتدا

ئەشعەریە جەهمیەکان بەوە ناسراون کاتێک باسی سیفەتێک لە سیفەتەکانی الله عز وجل ئەکەن لە سەرەتادا هەمان وتەی ئەهلی سوننە ئەڵێنەوە، بەڵام دوای هەندێک شتی زیادە ئەڵێن کە دەرخەری عەقیدە کەلامیە کوفریەکەیانە، وە پاش ئەوە بۆت دەردەکەوێت کە قسەکانی سەرەتایان ڕاستە لە ڕووکەشدا هەمان قسەی ئەهلی سوننەیە بەڵام لە حەقیقەتدا تەواو پێچەوانەی عەقیدەی ئەهلی سوننەیە و هەمان عەقیدەی جەهمی و موعتەزلیەکانی باوانیانە .

بە ڕووکەش ڕەددی موعتەزلیەکانیان ئەدەنەوە، وە لەڕاستیدا لەسەر هەمان بنچینەن، بەڵام لە هەندێ بابەتی لاوەکیدا جیاوازیان هەیە .

- أبو نصر السجزي (٤٤٤ ه) ئەڵێت :

پاشان ئەهلی سوننە تاقیکرانەوە دوای ئەمانە (واتا دوای موعتەزیلە) بە کەسانێک کە بانگەشەی ئەوەیان ئەکرد شوێنی قورئان و سوننەت کەوتوون،

بەڵام زیانیان له زیانی موعتەزیله و غەیری موعتەزیله زیاتر بوو، ئەوانیش بریتی بوون له : (ابو محمد ابن كلاب و ابو العباس القلانسي و ابو الحسن الاشعري) دوای ئەوانیش : (محمد بن ابي تريد له سجستان و ابو عبدالله ابن مجاهد له بەصره) له سەردەمی ئێمەشدا : (ابو بكر ابن الباقلاني له بغداد و ابو اسحاق الاسفراييني و ابو بكر ابن فورك له خوراسان)، جا ئەمانه ڕەددی هەندێک ووتەی موعتەزیله ئەدەنەوە، وە ڕەددی ئەهلی سوننه ئەدەنەوە زۆر لەوە زیاتر که ڕەددی موعتەزیله ئەدەنەوە.

رسالة إلى أهل زبيد في الرد على من أنكر الحرف والصوت

- وە پاشان **السجزي** له محمد بن عبدالله المالكي نقڵ ئەکات که ئەڵێت : أبو حسن الأشعري بۆ ماوەی چل ساڵ مایەوە لەسەر ئیعتیزال، دواتر تۆبەیەکی دەرخست له فروعەکان گەڕایەوە و لەسەر ئەسڵەکان به جێگیری مایەوە .

رسالة إلى أهل زبيد في الرد على من أنكر الحرف والصوت

هەربۆیه ئەگەر ئەشعەریەکی جەهمی قسەیەکی کرد که له ڕووکەشدا قسەی ئەهلی سوننه بوو ئەوە بێ شک و گومان بزانه که حەقیقەتی قسەکه جێگیر ناکات، بەڵکو ئەو تەحریفاته کەلامیه کوفریانه جێگیر ئەکات که خۆی بۆ وتەکانی سەلەفی ئەکات .

- تێڕابمێنە لەو وتەیانەی رسول الله ﷺ :

**٤١٠** - أبي سعيد الخدري رضي الله عنه ئەڵێت : وتمان ئەی رسول الله ﷺ، ئایا لە قیامەتدا پەروەدگارمان جل و عز ئەبینین؟

فەرمووی : (ئایا هیچ ئاستەنگیەک دێتە ڕێتان لە بینینی خۆر لە ڕۆژێکدا کە ئاسمان هیچ هەوری تێدا نەبێت؟) .

وتمان : نەخێر .

فەرمووی : (ئایا هیچ ئاستەنگیەت دێتە ڕێتان لە بینینی مانگی چواردە لە شەوێکی ساماڵدا کە هیچ هەوری تێدا نەبێت؟) .

وتمان : نەخێر ئەی رسول الله .

فەرمووی : (جا ئێوەش هیچ ئاستەنگیەک نایەتە ڕێتان لە بینینی لە ڕۆژی قیامەتدا وەک چۆن ئاستەنگیەکتان نایەتەپێش لە بینینیان) .

**السنة لـ عبدالله بن الإمام أحمد**

: واتای فەرموودەکەی رسول الله ﷺ ئەوەیە کە چۆن خۆر و مانگی چواردە بە جوانی و لە بەرزی ئەبینن، بەو شێوەیەش لە قیامەتدا الله تعالی ئەبینن، لەلای هەموو موسوڵمانێکیش ئەمە واتاکەیەتی، چونکە فەرموودەکە زۆر ڕوونە .

وە هاوەڵانیش رضي الله عنهم ڕووکەشی فەرموودەکە (کە مانای حەقیقیەتی) یان وەرگرتووە، وە سەلەف رحمهم الله لەسەر ڕێبازی هاوەڵان ڕۆیشتوون .

بەڵام جەهمی و موعتەزیلی و ماتوریدی و ئەشعەریە جەهمیەکان بەهۆی عەقیدە کەلامیە کوفریەکەیانەوە واتای ئەم فەرموودەیە ڕەت ئەکەنەوە، قسەی رسول الله ﷺ بەدرۆ ئەخەنەوە، دێن تەحریفی کەلامی کوفری بۆ وتەکەی رسول الله ﷺ ئەکەن، پاشان ئیمان بەو تەحریفاتانەی خۆیان ئەهێنن نەوەک وتەکەی رسول الله ﷺ، بەم شێوەیە هەموو سیفاتەکانی الله ڕەتئەکەوە و رسول الله ﷺ بەدرۆ ئەخەنەوە .

ئیمام **إبن بطة** رحمه الله لە **(الإبانة الكبري)** ئەڵێت : (جا جەهمیەکان بە کوفر و جەرائەتیان بۆ بەدرۆخستنەوەی قورئان وای گومان برد کە چاکەکاران و خراپەکاران هەردووکیان الله تعالى نابینن) .

**إبن القيم** لە **(حادى الأرواح)** دا ئەڵێت : (قورئان و سوننەتی موتەواتیر و ئیجماعی هاوەڵان و پێشەوایانی ئیسلام لەسەر ئەوەی لە قیامەتدا الله سبحانه و تعالى بە چاو ئەبینرێت، وەکو چۆن مانگی چواردە و خۆر ئەبینرێن لە ئاسمانێکی بێ هەوردا) .

**إبن تيمية** لە (**بيان تلبيس الجهمية**) ـدا ئەڵێت : (جێگیر بووە بە فەرموودەی موتەواتیر و کۆدەنگی سەلەفی ئوممەت و پێشەواکانیان لە هاوەڵان و تابیعین و ئەوانەی پاشیان لە پێشەواکانی ئیسلام کە لە بەهەشتدا الله سبحانه وتعالى بە چاو ئەبینرێت، وە قورئان لە چەند شوێنێکدا ئاماژەی بەوە داوە، وە فەرموودەی صحیح لەو بارەیەوە زۆرە کە موتەواتیرن لە کتێبە السنن و المسند ـەکاندا، وە **بابەتی بینینی الله تعالى لە گەورەترین جیاکەرەوەکانە لە نێوان ئەهلی سوننە جێگیرکەرەکان و جەهمیەکان، بگرە زانایانی ئەهلی حەدیث و سوننەت کتێب ئەنووسن دەربارەی جێگیرکردنی بینینی الله و ناوی ئەنێن (بینینی الله تعالى و ڕەددانەوەی جەهمیەکان)، وە بەدرۆخەرەوەی بینینی الله تعالى یان بە جەهمی داناوە)** .

- النووي **الأشعري الجهمي** لە خیانەتەکەی بۆ صحیح ی ئیمام مسلم (**١٥/٣**) ئەڵێت : (بزانە کە مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوەیە کە بینینی الله بە چاو شتێکە ئەکرێت ببێت و ئەستەم نییە لەڕووی عەقڵەوە، وە کۆڕان لەسەر ئەوەی لە قیامەت ڕووئەدات، وە ئیماندارەکان الله ئەبینن و کافرەکان نابینن، پاشان مەزهەبی ئەهلی حەق ئەوەیە کە بینینی الله بریتیە لە هێزێک کە الله تعالى دروستی ئەکات لە دروستکراوەکانیدا، شەرت نییە بە اتصال الأشعة، یان بینینی شتێکی بینراو بێت، یان شتێکی تری لەو جۆرە، وە ئیمامە

موتەلەکیمینەکانمان ئەوەیان جێگیر کردووە بە بەڵگە ڕوونەکان، وە مولزەم نابین لە بینینی الله دا بە دانانی شوێن بۆ الله، الله پاکڕاگیراوە لەوە، بەڵکو ئیمانداران لە هیچ شوێنێک ئەیبینن، وەک چۆن ئەزانن لە هیچ شوێنێک نییە) .

تەماشا بکە یەکەمجار النووي الجهمي ئەڵێت : (بزانە کە مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوەیە کە بینینی الله بە چاو شتێکە ئەکرێت ببێت و ئەستەم نییە لەڕووی عەقڵەوە، وە کۆڕان لەسەر ئەوەی لە قیامەت ڕووئەدات، وە ئیماندارەکان الله ئەبینن و کافرەکان نابینن) .

کە یەکەمجار ئەم قسەیانە ئەبیستیت و النووي الجهمي ناناسیت ئەڵێیت ما شاء الله عەقیدەی باشە، بەڵام هەر لەم قسانەیدا کە تەنها لە ڕووکەش لەسەر عەقیدەی سەلەفە ئاماژەیەکی تێدایە بۆ عەقیدە کەلامیە کوفریەکەیان .

النووي **الجهمي** ئەڵێت : (ئەستەم نییە لە ڕووی عەقڵەوە) .

فیرقە کەلامیە کوفریەکان عەقڵ (کە لە ڕاستیدا نیانە) پێش ئەخەن بەسەر نقڵدا .

بۆ نمونە : سەلەف تەماشان هەر شتێک بە سەنەدی صحیح هاتێبێت قبووڵی ئەکەن و ئیمانی پێ ئەهێنن .

بەڵام جەهمیەکان دێن تەماشا ئەکەن بزانن لەگەڵ عەقڵ (عەقیدەی کەلامی کوفری) یەکئەگرێتەوە یان نا؟ ئەگەر یەکینەگرتەوە ئەوە قورئان و فەرموودەکە فڕێ ئەدەن و عەقڵیان (کە نیانە) پێش ئەخەن بەسەر نقڵ دا .

وە ئەگەر جەهمیەک نەیەوێت ڕووی ڕەشی دەربکەوێت بۆ خەڵکی و ئاشکرا نەبێت کە ئایەت و فەرموودە ڕەتئەکاتەوە، ئەوە دێت تەحریف (کە خۆیان پێی ئەڵێن تەئویل) ێکی کەلامی کوفری بۆ قورئان یان فەرموودەکە ئەکات، پاشان ئەڵێت باوەڕم بە قورئان و فەرموودەکە هەیە !

نەخێر بە هیچ شێوەیەک وا نییە، بەڵکو سەد و هەشتا پلە پێچەوانەیەتی

.

ڕاستە ئەڵێت باوەڕم بە قورئان و فەرموودەکە هەیە، بەڵام لەڕاستیدا باوەڕی پێیان نییە، ئەگەر باوەڕی پێیانە بۆ ئیللا تەحریفی کوفریان بۆ ئەکات؟

بۆچی ئیللا بە تەحریفی کوفریەوە باوەڕ بە قورئان و فەرموودە هەیە؟

بێگومان ڕووی ڕەشی ئەم زەنیدقانە لە زووەوە دەرکەوتووە بۆ ئەهلی سوننە، چونکە بەبێ تەحریفاتەکانی خۆیان باوەڕیان بە قورئان و فەرموودە نییە .

النووي **الجهمي** ئەڵێت : (بینینی اللہ بریتیە لە هێزێک کە اللہ تعالی دروستی ئەکات لە دروستکراوەکانیدا، شەرت نییە بە اتصال الأشعة، یان بینین شتێکی بینراو بێت، یان شتێکی تری لەو جۆرە) .

کاتێک ئەڵێت : (بینینی اللہ بریتیە لە هێزێک کە اللہ تعالی دروستی ئەکات لە دروستکراوەکانیدا) ئەمە هەمان قسەی موعتەزلیەکانە، چونکە موعتەزیلەکان ئەڵێن بینینی اللہ لە قیامەتدا واتە اللہ زانستێک دروست ئەکات لە دروستکراوەکانیدا، النووي الجهمي یش تەنها زانستەکەی کردووە بە هێز، هەر ئەوەندە .

وە کاتێک ئەڵێت : (شەرت نییە بینینی شتێکی بینراو بێت)، ئەمە ڕەتکردنەوەی مانای حەقیقی فەرموودەکەی رسول اللہ یە ﷺ، چونکە ئەفەرمووێت چۆن مانگ و خۆر لە ئاسمانێکی سامالدا ئەبینن ئاوهاش اللہ تعالی ئەبینن، ئەمە بینینی بینراوێک نەبێت چ شتێکە !

هەر کەسێکی عاقڵ لە قسەی ئەشعەریە جەهمیەکان ڕابمێنێت زۆر بە ڕوونی بۆی دەرئەکەوێت لە چ کوفرێکدان .

***إبن تيمية*** دان بەوەدا ئەنێت کە مەزهەبی ئەشعەریە جەهمیەکان و موعتەزیلەکان لە بابەتی الرؤية دا هەمان شتە لە **درء التعارض بن العقل والنقل**

**(٢٥٠/١)** ئەڵێت : (**وەکو ئەهلی سوننە قسەیان کرد، بەڵام تەفسیریان کرد بە تەفسیری موعتەزیلەکان، وە وتیان : خیلافی نێوان ئێمە و موعتەزیلەکان خیلافێکی لەفظیە**) .

وە لە هەمان کتێب **(٢٣٧/٧)** ئەڵێت : (ئەشعەریەکان تەفسیری بینینی اللە تعالی یان کرد بە زیادبوونی عیلم، وە موعتەزیلەکان لەمەدا لەگەڵیان کێشەیان نییە، **- واتە لە تەحریف کردنی الرؤیة بە زیادبوونی عیلم -** ، وە وتیان : ئێمە و موعتەزیلە لە واتا دا خیلافمان نییە **- واتە لە واتای ئەو قسانەی ئەیکەن -** ، بەڵکو خیلافمان لەگەڵ موجەسیمەکانە) .

واتە ئەو قسەیانەی ئەشعەریە جەهمیەکان و موعتەزیلەکان لە دژی یەکتر ئەیکەن تەنها لە ڕووکەشدا لەیەک جیاوازە، وە لە ناوەڕۆکدا لەسەر هەمان بنچینەیە، وە موعتەزیلەکان تەحریفی واتای بینینی اللە ئەکەن زیادبوونی عیلم، وە ئەشعەریە جەهمیەکانیش تەحریفی ئەکەن بە زیادبوونی هێز لە دروستکراوەکاندا .

وە موجەسیمە و موشەبیهە دوو دەستەواژەن کە ئەشعەریە جەهمیەکان و موعتەزیلەکان و هەموو لقەکانی تری جەهمیەکان بەرامبەر موسوڵمانان و سەلەف بەکاریئەهێنن .

**إبن تيمية** لە **(بيان تلبيس الجهمية)** دا ئەڵێت : **(وتەی بینینی الله تعالی و نەفیکردنی ئەوەی لەسەر عەرش بێت هیچ کەسێک نەیوتووە ئیللا ئەم کۆمەڵە نزم و بێڕێزە نەبێت، ئەوانیش هاوەڵانی الأشعري ين) .**

وە دواتر دەربارەی حەقیقەتی وتە و عەقیدەی ئەشعەریە جەهمیەکان لە هەمان کتێب ئەڵێت : **(جا زانرا حەقیقەتی ناخی ئەمانە ناخی موعتەزیلە جەهمیە پەکخەرەکانە، ئەگەرچی ڕووکەشیان ڕووکەشی ئەهلی ئیثبات بێت - واتە عەقیدەی سەلەف -**، وەکو چۆن دوای لێکۆڵینەوە عەقیدەی حەقیقی موعتەزیلەکان عەقیدەی ئەو مولحیدانەیە کە بە تەواوی ناو و سیفاتەکانی الله بەدرۆ ئەخەنەوە، ئەگەرچی خۆیان وا پیشان بدەن ڕەددیان ئەدەنەوە) .

**السجزي** ئەڵێت : (ئەگەر وتی بینین تایبەت نییە بە چاو، ئەوە گەڕاوەتەوە بۆ قسەی موعتەزلیەکان، وە بینینی بە زانست داناوە) .

**رسالة إلى أهل زبيد في الرد على من أنكر الحرف والصوت**

ڕووی ڕەشی النووي زیاتر دەرئەکەوێت کاتێک ئەڵێت : (وە ئیمامە موتەلەکیمینەکانمان ئەوەیان جێگیر کردووە بە بەڵگە ڕوونەکان) .

موتەکەلیمینەکان (ئەوانەن کە خۆیان سەرقاڵ کردووە بە جەهلی الکلام ەوە) بە ئیمامی خۆی ئەزانێت، وە لەم بابەتەشدا وەکو ڕوونە شوێنی

فەرموودەی رسول الله ﷺ ناکەوێت، بەڵکو شوێن ئەو قاعیدە کەلامیە کوفریانە ئەکەوێت کە ئیمامە زەندیقەکانی دایانناوە بۆی .

تێڕابمێنە لە وتەکەی زۆر ڕوونە، ئاخر ئیمامە موتەکەلیمینەکانی بە چ بەڵگەیەکی ڕوون ئەم بابەتەیان ڕوون کردووەتەوە؟ بە بەڵگەی قورئان و فەرموودە؟ یان جەهل و کوفری الکلام؟ بێگومان بە جەهلی الکلام .

وە لە کۆتایدا کوفرێکی زۆر ئاشکرای دیکە ئەڵێت : (وە مولزەم نابین لە بینینی الله دا بە دانانی شوێن بۆ الله، الله پاکڕاگیراوە لەوە - واتە لە شوێن - ، بەڵکو ئیمانداران لە هیچ شوێنێک ئەیبینن، وەک چۆن ئەزانن لە هیچ شوێنێک نییە) .

لێرەدا نەفی ئەوە ئەکات الله عز وجل بە ذاتي خۆی لەسەر عەرش بێت، وە ئەڵێت لە قیامەتدا الله ئەبینرێت بەڵام لە هیچ شوێنێک نا ! ئێ ئەمەش هەمان قسەی موعتەزیلەکانە کە ئەڵێن بینینی الله واتە زانستێک کە الله دروستی ئەکات لە دروستکراوەکانیدا .

ئیمامی الدارمي رحمه الله ڕەددی جەهمیەکانی سەردەمی خۆی ئەداتەوە کە هەمان عەقیدەی النووي الجهمي یان هەبووە و ئەڵێت :

(وە ئەو قسەیەی کە وتت : ' الله وەسف ناکرێت بە شوێن ' ئەوە ئەسڵ و بنچینەی وتەی جەهم ە، وە پێچەوانەی ئەوەیە الله عز وجل و پێغەمبەرەکەی

ﷺ و ئیمانداران وتوویانە، چونکە الله تعالى ئەفەرمووێت : ﴿ أَأَمِنْتُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ ﴾ (الملک : ١٦) .

وە فەرمووی بە مەلائیکەکان : ﴿ يَخَافُونَ رَبَّهُمْ مِنْ فَوْقِهِمْ ﴾ (النحل : ٥٠) .

وە ئەفەرمووێت : ﴿ الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ ﴾ (طه : ٥) .

جا الله هەواڵی دا بەوەی لە کوێیە، وە شوێنەکەی خۆیی دیاری کرد، وە رسول الله ش ﷺ لە چەند فەرموودەیەکدا شوێنەکەی دیاری کردووە، ئەفەرمووێت : (هەرکەسێک ڕەحم نەکات بەوەی لەسەر زەویە ئەوەی ئاسمان ڕەحمی پێ ناکات)، جا ئەگەر وەسف نەکرایە بە شوێن وەکو چۆن تۆ بانگەشەی ئەکەیت هەی ڕەخنەگر و پێچەوانیکار ئەوە رسول الله ﷺ بە جاریەکەی نەئەوت : (الله لە کوێیە؟)، بۆ ئەوەی سەری لێ تێکبدات دەربارەی شتێک کە شوێنی نییە، وە کاتێک جاریەکە وتی : (لە ئاسمانە) ئەگەر هەڵەی تێدا بکردایە ئەوەی رسول الله ﷺ ڕەددی ئەدایەوە و فێری ئەکرد، بەڵام بەڵگەی بە زانستی جاریکەیە بەوەی الله لە ئاسمانە هێنایەوە بەوەی ئیماندارە) .

### نقض عثمان بن سعيد على المريسي الجهمي العنيد فيما افترى على الله من التوحيد

وە لە کۆتایشدا بزانە کە پەکخستنی ئەوەی الله بە ذاتی خۆی لەسەر عەرشە هۆکارێکی سەرەکیە بۆ نەفیکردنی بینینی حەقیقی الله تعالى، وە هەر

لەبەر ئەو هۆکارەشە ئەڵێت (ئەبینرێت بەڵام لە هیچ شوێنێک نا) ! ، چونکە هەر شتێک ببینرێت ئەبێت لە شوێنێک بێت .

لە کۆتاییدا بزانە کە هەر کەسێک بینینی حەقیقی اللە تعالی لە قیامەتدا ڕەت بکاتەوە کافر بووە، وە تووشی زەندەقە و جەهمیەت بووە .

# النووي الأشعري الجهمي و ڕەتکردنەوەی سیفەتی جوانیی و چاو بۆ الله تعالى

هەر کەسێک باوەڕی بە هەر سیفەتێکی الله تعالی نەبێت، ئەوە یان ڕاستەوخۆ سیفەتەکە ڕەت ئەکاتەوە بە ئاشکرا، یاخود تەحریفی سیفەتەکە ئەکات، وە باوەڕ بەو تەحریفە ئەکات کە خۆی بۆ سیفەتەکەی کردووە، وە مانای ڕاستەقینەی سیفەتەکەی قبووڵ نییە .

- النووي **الأشعري الجهمي** لە خیانەتە گەورەکەی بۆ **صحیح مسلم** **(٩٠/٢)** تەحریفی سیفەتی (الجمال : جوانی) الله تعالی ئەکات بە تەحریفاتی جەهمیەکان، وە بەڵگە بە وتەی ئیمامەکانی أبو القاسم القشيري ئەشعەری و الخطابي کوللابی ئەهێنێتەوە .

تەحریفاتی النووي بۆ ئەم فەرموودەیەی رسول الله یە ﷺ کە ئەفەرمووێت : (الله عز جوانە، وە جوانیشی خۆشئەوێت) .

هەموو موسوڵمانێک لەم فەرموودەیە وا تێئەگات کە الله عز وجل جوانە و سیفەتی جوانیی هەیە، وە لەگەڵ ئەوەشدا هەموو کار و کردەوە و شتێکی جوانی خۆشئەوێت، ئەوە مانای ڕووکەش و حەقیقی فەرموودەکەیە .

بەڵام لە تەحریفەکەی بۆ سیفەتی جوانیی النووي الجهمي ئەڵێت : (واتە : ئەوەی الله فەرمانی پێکردووە جوانە) .

لێرەدا النووي ناڵێت الله خاوەنی سیفەتی الجمال نییە، بەڵکو دێت ئەڵێت الجمال واتە ئەوە و ئەوە (تەحریفاتی جەهمیەکان) .

ئاخر ڕاستە ئەوەی الله فەرمانی پێکردووە جوانە، بەڵام ئەمە خۆدزینەوە و خۆڵکردنەچاو و تەحریفی وتەی رسول الله ﷺ (الله عز جوانە) یە، چونکە لێرەدا رسول الله ﷺ باسی سیفەتێکی ذاتی ئەکات بۆ الله عز وجل کە خاوەنیەتی، وە لە بەشی دووەمی قسەکەیدا ئەفەرمووێت (وە جوانیشی خۆشئەوێت)، لێرەدا مانای قسەکەی ئەوەیە وەک چۆن الله جوانە و خاوەنی سیفەتی جوانیە، بە هەمان شێوە جوانییشی خۆش ئەوێت، بەڵام النووي **الجهمي** بەشی یەکەمی وتەکەی رسول الله ﷺ ڕەتئەکاتەوە و ئەوە جێگیر ناکات کە الله عز وجل لە حەقیقەتدا جوانە و خاوەنی سیفەتی جوانیە، بەڵکو دێت تەحریفی واتای سیفەتی جوانی ئەکات بە لێکەوتەکانی سیفەتی جوانی، بەم شێوەیە سیفەتی جوانی و لێکەوتەکانی سیفەتی جوانی یەکسان ئەکات بە یەک .

النووي **الجهمي** شوێن ئیمامە جەهمیەکانی کەوتووە لە ڕەتکردنەوەی سیفەتی الجمال دا، ئیمامەکانی بە ڕاستەوخۆ ڕەتیان کردووەتەوە، بەڵام النووي لە ڕێگەی تەحریفاتەوە ڕەتی ئەکاتەوە .

- ئیمام **عبدالله بن أحمد بن حنبل** رحمهم الله ئەڵێت : مهنا السلمي بۆی گێڕامەوە وتی : (فەرموودەی أبي ريحانة عن النبي ﷺ : ' الله جوانە و جوانییشی خۆش ئەوێت ' م بۆ علي بن الجعد گێڕایەوە، جا ڕەتی کردەوە بڵێت ' الله جوانە و جوانییشی خۆش ئەوێت ' بەڵکو وتی ' جوانیي خۆش ئەوێت ' .

**السنة**

- ئیمام **مسلم بن حجاج** رحمه الله دەربارەی علي بن الجعد ئەڵێت : (ثقة یە، بەڵام جەهمیە) .

**سير أعلام النبلاء**

لێرەدا علي بن جعد ناڵێت الله سیفەتی جوانیي هەیە، بەڵکو تەنها ئەڵێت جوانیي خۆش ئەوێت، هەرکەسێکیش بگەڕێتەوە تەماشای تەئویلاتەکانی النووي بکات ئەبینێت دان بەوەدا نانێت الله خاوەنی سیفەتی جوانیە، بەڵکو وەکو علي بن جعد تەنها بەشی دووەمی فەرموودەکەی قبووڵە کە ئەفەرمووێت (وە جوانیشی خۆش ئەوێت) .

لە (صحيح مسلم) ـدا هاتووە کە رسول الله ﷺ ئەفەرموویت : (الله عز وجل چاوێکی کوێر نییە، وە مەسیحی دەججال چاوی ڕاستی کوێرە، چاوی وەکو ترێی دەرپۆقیو وایە) .

ئیمامەکانی سەلەف رحمهم الله لەم فەرموودەیە تێگەیشتوون و ڕەتیان نەکردووەتەوە، هەربۆیە فەرموویانە کە الله عز وجل خاوەنی دوو چاوە، چونکە رسول الله ﷺ ئەفەرموویت : (الله عز وجل چاوێکی کوێر نییە، وە مەسیحی دەججال چاوی ڕاستی کوێرە)، واتە الله عز وجل چاوێکی کوێر نییە، وە دەججال چاوێکی کوێرە، کەوابێت الله عز وجل خاوەنی دوو چاوە .

- **عبدالله بن الإمام أحمد** رحمهم الله لە **(كتاب السنة)** ـدا بابێکی هێناوە بەناوی **(إثبات العينين لله عز وجل، وما ورد في الدجال وصفته)**، واتە جێگیرکردنی دوو چاو بۆ الله عز وجل، وە ئەوەی هاتووە دەربارەی دەججال و تایبەتمەندیەکەی .

لەم بابـەدا **٢٣** فەرموودە ئەهێنێت کە باسی تایبەتمەندیەکانی دەججال ئەکات، وە لەم فەرموودەیانەوە ئەوە تێگەیشتوون کە الله عز وجل خاوەنی دوو چاوە بە خیلافی دەججال کە چاوێکی هەیە .

- وە لە کتێبی **(نقض الدارمي على المريسي)** ی **ئیمام عثمان بن سعيد الدارمي** رحمه الله بابێک هەیە بە ناوی **(الكلام عن إثبات صفة العين لله تعالى)**، واتە قسەکردن لەسەر جێگیرکردنی سیفەتی چاو بۆ الله تعالى، وە لە

هەمان کتێبدا ئەڵێت : (له فەرموودەی رسول الله ﷺ ' الله چاوێکی کوێر نییه ' ، نیشانەی ئەوەی تێدایه که الله بینەره خاوەنی دوو چاوه به خیلافی کەسێک که چاوێکی کوێره ' ) .

- وه إبن خزيمة رحمه الله له کتێبی **(کتاب التوحيد)** ـدا باب ێکی هێناوه به ناوی **(باب ذكر إثبات العين لله جل و علا، على ما ثبته الخالق البارئ لنفسه في محكم تنزيله وعلى لسان نبيه المصطفى ﷺ) .**

لەم باب ـەدا دێت به بەڵگەی ئایەتی قورئان ئەیسەلمێنێت که الله عز وجل خاوەنی چاوه، پاشان دێت ٦ فەرموودە ئەهێنێتەوه دەربارەی سیفەتەکانی دەججال .

چەند نمونەیکی تر هەیه بەڵام بەوەندە کۆتایی پێ ئەهێنین .

- إبن القيم له کتێبی **(إجتماع الجيوش الإسلامية على حرب المعطلة والجهمية)** ـدا ئەڵێت : (باسی دەججال، وه ئەوەی که کوێره، فەرموویەتی (پەروەردگاری ئێوه چاوێکی کوێر نییه)، کەواته دوو چاوی بۆ جێگیر کرد) .

- بەڵام النووي **الأشعري الجهمي** له خیانەتەکەی بۆ **صحيح مسلم (٢٣٦/٢)** ـدا له باسی فەرموودەکەی دەججال ـدا ئەڵێت : ( ' پێغەمبەر ﷺ

ئەفەرموویت : (الله عز وجل چاوێکی کوێر نییە، وە مەسیحی دەجال چاوی ڕاستی کوێرە، چاوی وەکو ترێیەکی دەرپۆقیو وایە ' ئەم قسەیە واتە الله پاکڕاگیراوە لە تایبەتمەندی دروستکراوەکان) .

لێرەدا النووي الجهمي ئەوە ڕەت ئەکاتەوە کە الله عز وجل خاوەنی دوو چاوە، وە مانای ڕووکەش و حەقیقی فەرموودەکە و وتەی رسول الله ﷺ ڕەتئەکاتەوە، وە بە پێچەوانەی سەلەف رحمهم الله تەفسیری فەرموودەکە ئەکات، بەڵکو ڕێک وەکو ئیمامە جەهمیەکانی ئەڵێت (واتە الله پاکڕاگیراوە لە تایبەتمەندی دروستکراوەکان)، واتە الله خاوەنی سیفەتی چاو نییە .

لە کۆتاییدا بزانە کە سەلەف رحمهم الله هەر سیفەتێک لە قورئان و فەرموودە و ئیجماعی سەلەفی پێش خۆیاندا هاتبێت وەریئەگرن و ڕەتی ناکەنەوە، وە لێرەدا باوەڕیان وایە کە الله عز وجل خاوەنی دوو چاوە، وەکو موشەبیهەکان ناڵێن الله تعالی چاوی ئاوا و ئاوایە، بەڵکو ئەفەرموون تەنها الله تعالی خۆی ئەزانێت چاوی چۆنە و لە چاوی دروستکراوەکانی ناچێت .

وە وەکو جەهمیە زەندیقەکان کە جەهل و کوفری کەلامیان لێبووە بە قورئان و سوننەت نایەن سیفەتەکە و وتەی رسول الله ﷺ ڕەت بکەنەوە بە تەحریفێک کە لەگەڵ کوفری کەلامیدا یەکبگرێتەوە .

# فێڵی ئەشعەریە جەهمیەکان لە تەحریفکردن و پەکخستنی سیفاتەکانی الرحمن

ئەگەر کەسێک سیفەتێک لە سیفەتەکانی الله عز وجل ڕەتبکاتەوە وا خۆشترە ڕاشکاو و بەغیرەت بێت و بڵێت الله فلانە سیفەتی نییە، نەوەک وەکو ئەشعەریە جەهمیە زەندیقەکان چەندین پێچ و پەنا بکەن و لە کۆتاییدا واتای قسەکەیان هەمان واتای قسەی جەهمیەکانی سەرەتا و موعتەزیلە و بگرە خراپتریش بێت .

هیچ جەهمیەک نابینیت بە ڕاشکاوی بڵێت الله لەسەر عەرش نییە، بەڵکو ئەڵێت لەسەر عەرشە، بەڵام لەسەر عەرشە واتا زانستەکەی لەسەر عەرشە .

ناڵێت الله تعالى سیفەتی تەماشاکردن و بینینی نییە بە ڕاشکاوی، بەڵکو ئەڵێت سیفەتی تەماشاکردن و بینینی هەیە، بەڵام تەماشاکردن واتە ڕەحم پێکردن! وە قسە لەگەڵ کردن واتە الله مخلوق ێک دروست بکات و ئەوەی ئەیەوێت لە ڕێگەی مەخلوقەکەوە بیگەیەنێت!

ئەمە پەکخستنی سیفەتی علو و قسەکردن و بینینە بەڵام بە پەکخستنێکی فێڵاوی بۆ هەڵخەڵەتاندنی ئەو کەسانەی شارەزای عەقیدەیان نین .

ئێستا ئەشعەریەکان ئەزانن سەلەف ئەفەرموون قورئان کەلامی الله ە، وە غیر مخلوق ە، هەرکەسێک بڵێت مخلوق ە کافرە، سەلەف لێرەدا مەبەستیان ئەوەیە ئەو قورئانەی کە الله عز وجل بە جبریل ی علیه سلام فەرمووە و جبریل یش بە رسول الله ﷺ وتووە، وە رسول الله ﷺ بە هاوەڵانی رضي الله عنهم وتووە، وە ئەوانیش بەدوای خۆیان وتووە و لە موسحەفەکاندا ئەینووسن و خەڵکی لەبەری ئەکەن و ئەیلێنەوە، ئەوە مخلوق نییە، هەرکەسێکیش بڵێت ئەوە مخلوق ە ئەوە کافرە .

لەملاشەوە ئەشعەریە جەهمیە لەفزیە کوللابیەکان لە ڕووکەشدا هەمان قسەی ئەهلی سوننە ئەکەن، ئەڵێن قورئان کەلامی الله یە و مخلوق نییە، بەڵام سەد و هەشتا پلە قسەکەیان لە ناوەڕۆکدا جیاوازە لە وتەی موسوڵمانان، وە موتابیقە لەگەڵ وتەی جەهمیەکانی پێش خۆیان .

چونکە لەفزیە جەهمیەکان پێیان وایە دوو قورئان هەیە، دانەیەکیان مخلوق ە والعیاذ بالله، وە دانەیەکیان غیر مخلوق ە و پێی ئەوترێت کەلامی نەفسی و الله عز وجل ناتوانێت دەریببڕێت و بیڵێت والعیاذ بالله !

چی ئه‌بوو وه‌كو سه‌له‌ف رحمهم الله ئیمانیان بهێنایه‌ به‌ قورئان و فه‌رمووده‌ و ئاثار، وه‌ كافر ببونایه‌ به‌ جه‌هلی كه‌لام؟!

به‌ڵام ئه‌و جه‌همیانه‌ كافر بوون به‌ كه‌لامی الله تعالی و رسول ـه‌كه‌ی ﷺ، وه‌ كوفری كه‌لامیان پێشخست به‌سه‌ریدا .

هه‌ربۆیه‌ بزانه‌ رحمک الله هه‌میشه‌ ئه‌شعه‌ریه‌ جه‌همیه‌كان سیفه‌ته‌كانی الله عز وجل به‌ڕاشكاوی په‌كناخه‌ن، ئه‌وه‌نده‌ بێغیره‌تن كه‌ هه‌زار پێچ و په‌نا ئه‌كه‌ن تا جه‌همیه‌ت و كوفره‌كه‌ی خۆیان بشارنه‌وه‌ .

- النووي **الأشعري الجهمي** له‌ **شرح صحيح مسلم (١١٦/٢)** له‌ ته‌فسیری ئایه‌تی | **وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ** | (آل عمران : ٧٧) .

ئه‌ڵێت : (ته‌ماشاكردنی سبحانه وتعالى بۆ به‌نده‌كانی بریتیه‌ له‌ ره‌حمپێكردنیان) .

ئیمام **الكرجي القصاب** رحمه الله له‌ كتێبی **(نكت القرآن)** ئه‌ڵێت : (فه‌رمایشتی | **إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُولَٰئِكَ لَا خَلَاقَ لَهُمْ فِي الْآخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ** | **(آل عمران : ٧٧)** به‌ڵگه‌یه‌ له‌سه‌ر جه‌همیه‌كان له‌ قسه‌كردن و ته‌ماشاكردندا) .

تەماشا بکە رحمک الله ئایەتەکە ئەفەرمووێت کە الله تعالی قسەیان لەگەڵ ناکات و وە تەماشایان ناکات، ئەمە قسەکردن و تەماشاکردنێکی حەقیقیە، وە سیفەتی الله تعالی ە .

بەڵام النووي **الجهمي** دێت سیفەتی تەماشاکردنی الله تعالی تەفسیر ئەکات بەو شتەی کە لە ئەنجامی تەماشاکردنی الله تعالی ڕووئەدات، ئەویش بریتیە لە ڕەحم پێکردن .

واتە خودی سیفەتی تەماشاکردنەکە بۆ الله تعالی جێگیر ناکات، وە مانای سیفەتەکە ئەگۆڕێت بە شێوەیەک لەگەڵ عەقیدەی جەهمیەتەکەی خۆیدا بگونجێت .

- النووي **الأشعري الجهمي** لە **شرح صحيح مسلم (٩٧/٣)** دا ئەڵێت :
(وتەی ﷺ ' خێر لە دەستەکانتدایە ' ، لە دەستەکانتدا واتە لەلای تۆ) .

تەماشا بکە رحمک الله چۆن بە ئاشکرا ئەڵێت لە دەستەکانت واتە لەلای تۆ، ئێ ڕاستە خێر هەر لەلای الله تعالی ەوەیە بەڵام ئەم جەهمیە هەمیشە ڕائەکات لەوەی سیفەتەکانی الله تعالی جێگیر بکات وەک چۆن سەلەف رحمهم

الله جێگیریان کردووە، دووبارە لێرەدا تەحریفی سیفەتی دەستی کردەوە بۆ الله عز وجل بە تەحریفاتی جەهمیەکان .

ئەهلی سوننە و جەماعە ئەفەرموون کە الله تعالی خاوەنی دوو دەستە، وە هەموو خێر و نیعمەتێک لەلای خۆیەوەیەتی .

- النووي **الأشعري الجهمي** لە **شرح صحيح مسلم (٧٦/١٧)** دا ئەڵێت : (لە فەرموودەی ﷺ ' الله عز وجل شەو دەستەکانی بڵاو ئەکاتەوە بۆ ئەوەی لە خراپەکارانی ڕۆژ خۆش ببێت، وە ڕۆژ دەستەکانی بڵاو ئەکاتەوە بۆ ئەوەی لە خراپەکارانی شەو خۆش ببێت '، جا بڵاوکردنەوەی دەست واتە قبووڵکردنی تۆبە لێیان) .

دووبارە لێرەدا تەحریفی سیفەتی دەست و بڵاوکردنەوەی دەست ئەکات بە تەحریفاتی جەهمیەکان .

عەقیدەی سەلەف رحمهم الله بۆ ئەم فەرموودەیە ئەوەیە کە الله تعالی هەر بەڕاستی خاوەنی دەستە، وە دەستەکانی خاوەنی سیفەتی بڵاوکردنەوەیە، وە کاتێک دەستی بڵاو ئەکاتەوە بۆ ئەوەیە لە بەندەکانی خۆش ببێت .

بەڵام لەلای جەهمیەکان کوفرە ئەگەر بڵێیت الله تعالی خاوەنی دوو دەستە، لەکاتێکدا لە قورئان و فەرموودەی صحیح دا هاتووە، لای ئەوان ئەم

فەرموودەیە تەنها واتا الله لە بەندەکانی خۆش ئەبێت و تەواو، ئەمەش نەفیکردن و پەکخستنی سیفەتەکانی الله عز وجل ە .

# النووي الأشعري الجهمي و ڕەتکردنەوەی فەرموودەی رسول الله ﷺ دەربارەی سیفەتەکانی الله تعالی

- النووي **الأشعري الجهمي** لە **شرح صحيح مسلم (٣٢/٣)** تەحریفی وتەی رسول الله ﷺ ئەکات بە تەحریفاتی جەهمیە پەکخەرەکان و ئەڵێت : (وتەی ﷺ : ' مشتێک ئەگرێت لە جەهەننەم ' ) واتە کۆمەڵێک کۆئەکاتەوە) .

پوختەی فەرموودەکە ئەوەیە کە رسول الله ﷺ، وە پاشان مەلائیکەکان و پیاوچاکان بە مۆڵەتی الله تعالی شەفاعەت ئەکەن، پاشان الله عز وجل سێ مشت لە مشتی خۆی لەو موسوڵمانانەی بەر شەفاعەت نەکەوتوون ئەیانگرێت و ئەیانهێنێتە دەرەوە لە جەهەننەم .

کەواتە الله عز وجل هەم سیفەتی دەستی هەیە، وە هەم سیفەتی (قَبض و قبضة) ی هەیە، واتە گرتن، وە مشت .

بەڵام لێرەدا النووي **الجهمي** سیفەتی گرتن و مشت بۆ الله تعالی جێگیر ناکات، بەڵکو بە تەحریفاتێک تەحریفی ئەکات کە لەگەڵ عەقیدەی کەلامیە جەهمیە کوفریەکەیدا بگونجێت .

- النووي **الأشعري الجهمي** لە **شرح صحيح مسلم (٢٠٤/١٦)** تەحریفی وتەی رسول الله ﷺ ئەکات بە تەحریفاتی جەهمیە پەکخەرەکان و ئەڵێت : (وتەی ﷺ : ' دڵەکانی ئادەمیزاد هەموویان لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی الرحمن دایە، وەکو یەک دڵ چۆنی بووێت هەڵیئەسووڕێنێت '، ئەمە لە فەرموودەکانی سیفاتە، دوو وتەی لەبارەوە هاتووە، یەکەمیان بریتیە لە ئیمان پێهێنانی بەبێ ئەوەی تەئویل بکرێت، وە بەبێ زانینی واتاکەی، وە ئیمان ئەهێنرێت بەوەی حەقە وە **ڕووکەشەکەی مەبەست نییە** . . . وە دووەم وتە بریتیە لەوەی کە **تەئویل ئەکرێت** . . . پاشان بە تەئویلاتی جەهمیەکان تەئویلی ئەکات) .

سەلەف رحمهم الله باوەڕیان بە قورئان و فەرموودە هەبووە و ڕەتیان نەکردووەتەوە، وە بناغەی عەقیدەی خۆیانیان لەسەری دامەزراندووە، وە لەسەر ڕووکەش وەریان گرتووە، بەڵێ دڵی هەموو مرۆڤەکان لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی الله تعالى دایە، چۆن؟ هیچ کەسێک چۆنیەتی نازانێت، وەکو ئیمام مالک دەربارەی سیفەتی الإستواء ئەڵێت : (والكيف غير معقول) واتە چۆنیەتیەکەی ناتوانرێت بیری لێ بکرێتەوە، بەڵێ هەر بەڕاستی وایە، ئێمە کە ناتوانین بیر لە چۆنیەتی مەلائیکە و جنۆکە و بەهەشت و جەهەننەم و سیفەتەکانیان بکەینەوە کە وەکو ئێمە مەخلوقن، ئەوکات بە هیچ شێوازێک ناتوانین بیر لە چۆنیەتی سیفەتەکانی الله عز وجل بکەینەوە .

بەڵام النووي **الأشعري الجهمي** سیفەتی پەنجە بۆ الله تعالی پەکئەخات، لەبەر ئەوەی عەقیدەی جەهمیەکانی هەیە و پێی وایە ئەگەر ڕووکەشی فەرموودە وەربگریت تووشی کوفر و تەشبیه ئەبیت، وەک چۆن لێرەدا ئەڵێت : (ڕووکەشەکەی مەبەست نییە) بۆ ڕووکەشەکەی مەبەست نییە؟ چ کێشەیەک هەیە لە ڕووکەشەکەیدا؟ چ کێشەیەک هەیە لەوەی کافر نەبیت بەرامبەر فەرموودەکە و بڵێیت الله عز وجل پەنجەی هەیە، پەنجەیەک کە شایستەی خۆیەتی و لە پەنجەی دروستکراوەکان ناچێت و چۆنیەتیەکەی نەزانراوە؟

بەڵام ئەم جەهمیانە فەرموودەکانیان پێ قبووڵ ناکرێت و بە تەشبیهی ئەزانن، بۆیە پێش ئەوە لە مانای حەقیقی و ڕووکەشی فەرموودەکە ڕائەکات و ئەڵێت : (بەبێ زانینی واتاکەی)، لێرەدا خۆی ئەدزێتەوە لە جێگیرکردنی واتای فەرموودەکە و ئەڵێت واتای پەنجە دیار نییە! بۆ دیار نییە پەنجە هەر واتە پەنجە، ئەگەر واتاکەی دیار نەبوویایە ئەوە هاوەڵان رضي الله عنهم پاش بیستنی فەرموودەیە ئەیانفەرموو : پەنجە واتای چییە؟ بەڵام لەبەر ئەوەی واتاکەی زۆۆۆر ڕوونە و هیچ کەسێک پرسیاری لەبارەوە نەکردووە و وەکو خۆی قبووڵیان کردووە .

- النووي **الأشعري الجهمي** لە **شرح صحيح مسلم (١٢٩/١٧)** تەحریفی وتەی رسول الله ﷺ ئەکات بە تەحریفاتی جەهمیە پەکخەرەکان و ئەڵێت :

(وتەی ﷺ ' الله ئاسمانەکان لەسەر پەنجەیەک ئەگرێت، وە زەویەکان لەسەر پەنجەیەک . . هەتا ئەڵێت پاشان ئەیانلەرزێنێت)، ئەمە لە فەرموودەکانی سیفاتە و دوو مەزهەب لەبارەیەوە هاتووە، تەئویل کردنی، وە تەئویل نەکردنی ئیمان پێ هێنانی و لەگەڵ ئەوەی باوەڕت بەوە هەبێت ڕووکەشەکەی مەبەست نییە) .

ئەو دوو ڕێگەیەی ئەم جەهمیە باسی ئەکات ڕێگەی جەهمیەکانی باوانیەتی .

ئاخر ئەمە چ ئیمان پێ هێنانێکە مانای وتەکەی ڕەت بکەیتەوە؟ وەکو ئەوە وایە بە کەسێک بڵێیت : باوەڕم بە قسەکەت هەیە بەڵام درۆ ئەکەیت!

چۆن ئەکرێت واتای ڕووکەش و حەقیقی فەرموودەی رسول الله ﷺ و تێگەیشتنی موسوڵمانان ڕەت بکەیتەوە و لەسەر ئەساسی عەقیدەیەکی کەلامی جەهمی کوفری بێیت بڵێیت ڕووکەشەکەی مەبەست نییە؟ ئاخر بۆ ڕووکەشەکەی مەبەست نییە؟ خۆ ئەگەر ڕووکەشەکەی مەبەست نەبووایە رسول الله ﷺ ڕوونی ئەکردەوە ئەیفەرموو ئەم قسەیەی من واتە ئەوە و ئەوە، بەڵام هۆکارەکە ناڕوونی مانای فەرموودەکە نییە، بەڵکو فەرموودە زۆر ڕوونە، بەڵام عەقیدە جەهمیەتەکەی النووي ڕێگەی پێ نادات وتەی الله و رسول ەکەی ﷺ سەر بخات بەسەر ئەو عەقیدە کوفریەی هەیەتی، وە وتەکەیان بە تەشبیه و تەجسیم و کوفر نەزانێت .

- النووي **الأشعري الجهمي** له خیانەتەکەی بۆ صحیح ی ئیمام مسلم (١٨٢/١٧) ئەڵێت : (وتەی رسول الله ﷺ ' جەهەننەم هەر ئەڵێت : زیاتر هەیە؟ هەتا پەروەردگاری خاوەن عیززەت تبارک و تعالى پێی ئەخاتەناوی - وە لە هەندێک ڕیوایەتدا ئەخاتە سەری - پاشان ئەڵێت : بەسە بەسە '، پێشتر چەند جارێک باسمان کرد کە دوو ڕێباز هەیە لەمەدا، یەکێکیان وتەی هەموو سەلەف و کۆمەڵەیەک لە موتەکەلیمینە کە تەئویلی ناکەن و ئیمان ئەهێنن بەوەی کە ڕاستە و ڕووکەشەکەی مەبەست نییە .

وە دووەمیان بریتیە لە تەئویل کردنی، ئەمەش وتەی زۆربەی موتەکەلیمەکانە) پاشان دێت هەندێک تەحریفاتی جەهمیەکان باس ئەکات بۆ فەرموودەکە وە لە کۆتایدا ئەڵێت : (وە بێگومان ئەبێت لە ڕووکەشەکەی لاببرێت بەپشتبەستن بەڵگەی قەطعی عەقڵی) .

لێرەدا النووي **الجهمي** سیفەتی (قَدَم) واتە پێ بۆ الله عز وجل پەکئەخات، وە زۆر بەبێ شەرمانە مەزهەبی موفەویضە جەهمیەکان ئەداتە پاڵ سەلەف، وە ئەڵێت (ڕووکەشەکەی مەبەست نییە)، حاشا لەوەی سەلەف رحمهم الله خاوەنی ئەو عەقیدەی کوفریە بووبن .

وە لەلای ئەم جەهمیە رسول الله ﷺ بە کۆمەڵە وتەیەک وەسفی الله تعالى ی کردووە کە ڕووکەشەکەی کوفرە و جائیز نییە!

پاشان لە تەحریفکردنەکەدا باسی هەندێک تەحریفاتی جەهمیەکان ئەکات، پاشان لە کۆتایدا ئەڵێت (وە بێگومان ئەبێت لە ڕووکەشەکەی لاببرێت بە پشتبەستن بە بەڵگەی قەطعی عەقڵی) .

لەلای کەلامیە جەهمیەکان قورئان و فەرمووده بەڵگەی نەقڵین، وە کوفری کەلام بەڵگەی عەقڵیە، وە بەو بەڵگە کەلامیە کوفریانەی خۆیان داینناوه ئەڵێن (بەڵگەی قەطعی) واتە بەڵگەی بنبڕکەر، واتە لە سەدا سەد ڕاستە و قسەی تێدا ناکرێت، بەم شێوەیە هەمیشە کوفری کەلام پێش ئەخەن بەسەر وتەی الله عز وجل و وتەی رسول الله ﷺ .

تەماشا بکە بە چ شتێک فەرموودەکەی بەدرۆ خستەوە و سیفەتەکەی پەکخست؟ بە قورئان و سوننەت یان بە کوفری کەلام؟ بێگومان بە کوفری کەلام، کەواتە ئەم جەهمیانە هەرکاتێک قورئان و سوننەت لەگەڵ عەقیدەی کوفریە کەلامیەکەیاندا نەگونجێت یەکسەر بێ دوودڵی کوفری خۆیان دەرئەخەن و کافر ئەبن بە قورئان و سوننەت، وە تەحریفی قورئان و سوننەت ئەکەن بۆ ئەوەی لەگەڵ کوفری کەلامدا بگونجێت .

وەکو هەموو سیفەتەکانی تر لەلای سەلەف و ئەهلی سوننە الله تعالى خاوەنی سیفەتی (قَدَم) واتە پێ یە، پێ یەکی حەقیقی کە چۆنیەتیەکەی دیار نییە و لە پێ ی دروستکراوەکانی ناچێت .

- النووي **الأشعري الجهمي** لە خیانەتەکەی بۆ صحیح ی ئیمام مسلم **(٤٨/٣)** ئەڵێت : (وتەی رسول الله ﷺ ' دەرئەکەوێت بۆیان پێئەکەنێت '، مانای دەرئەکەوێت بۆیان پێئەکەنێت واتە دەرئەکەوێت و لێیان ڕازیە) .

لێرەدا النووي **الجهمي** سیفەتی (ضَحِک) واتە پێکەنین بۆ الله تعالی پەکئەخات، وە تەحریفی واتای سیفەتەکە ئەکات بە شتێک کە لە ئەنجامی سیفەتەکەوە دێتە کایەوە وەک پێشتر باسمان کرد، چونکە ئەگەر الله تعالی پێبکەنێت بەرامبەر بەندەیەکی واتا لێی ڕازیە، وە لەگەڵ ئەوەشدا الله تعالی سیفەتی پێکەنینی حەقیقی هەیە، بەڵام ئەم جەهمیە کافرە بە سیفەتی پێکەنینی حەقیقی الله تعالی، هەربۆیە تەحریفی ئەکات .

- ئیمام **أحمد بن حنبل** رحمه الله دەربارەی کەسێک ئەڵێت : (بەڵام لێوەی گێڕدراوەتەوە باسی فەرموودەی الضَّحِک - پێکەنین - ی کردووە و وتوویەتی ' وەکو گوڵ کاتێک ئەگەشێتەوە '، وە ئەمەش **وتەی جەهمیەکانە)** .

**الأبانة الكبرى**

ئەو کەسەی کە ئیمام أحمد باسی ئەکات لەجیاتی ئەوەی مانای ڕووکەشی و حەقیقی فەرموودەکە وەربگرێت وشەی الضحک ی تەحریف کردووە، بە هەمان شێوە النووي الجهمي سیفەتی پێکەنین جێگیر ناکات و واتاکەی

ئەگۆڕێت، وە النووي و ئەو کەسەی ئیمام أحمد باسی کردووە هەردووکیان جەهمی و پەکخەر و کافرن .

- ئیمام **إبن بطة** رحمه الله دەربارەی فەرموودەی رسول الله ﷺ (الله پێکەنی لە بێهیوابوونی بەندەکەی، وە زوویی و نزیکی گۆڕانی باردودۆخی) پرسیاری کرد لە محمد بن عبدالواحد غلام ثعلب، وتی : (**فەرموودەیەکی ناسراوە، وە ڕیوایەت کردنی سوننەتە، وە ڕەتکردنەوەی بە تانەلێدان بیدعەیە، وە تەفسیرکردنی الضَّحِک زۆرلەخۆکردن و ئیلحادە**) .

**الأبانة الکبری**

: تەماشا بکە رحمک الله مانای فەرموودەکە ڕوونە و پێویستی بە قسە لەسەرکردن و تەفسیرکردن نییە، بۆیە غلام الثعلب ئەڵێت (تەفسیرکردنی الضَّحِک زۆرلەخۆکردن و ئیلحادە) مەبەستی ئەو تەحریفەیە کە النووي الجهمي و ئەو کەسەی ئیمام أحمد باسی کرد کردوویانە، هەربۆیە النووي جەهمی و مولحیدە .

- ئیمام **الآجري** رحمه الله ئەڵێت : ( ' پەروەردگارت عز وجل بۆیان پێئەکەنێت ' . . . **وە هیچ کەسێک ئەم سوننەتانە ڕەتناکاتەوە ئیلا کەسێک**

**نەبێت کە مەزهەبی موعتەزیلەکانی هەیە**، جا هەر کەسێک ڕەتیکردەوە یان دژایەتی کرد یان وتی : چۆن؟! ئەوە تۆمەتباری بکەن و ئاگاداری بن) .

الشريعة

: ئەسڵی موعتەزیلە و جەهمی و ئەشعەری و ماتوریدیەکان لە ڕەتکردنەوەی سیفاتەکانی الله عز وجل یەک شتە .

- إبن القيم ئەڵێت : (أبو رزين رضي الله عنه فەرمووی ' بێهیوا نابین لە چاکە و خەیری پەروەردگارێک کە پێبکەنێت ' وە **کەسێکی جەهمی ئەگەر پرسیاری لێ بکرێت دەربارەی ئەمە ئەڵێت پێکەنینی بۆ جائیز نییە** هەر وەکو چۆن الإستواء و هاتنەخوارەوە و هاتن ی بۆ جائیز نییە) .

الصواعق المرسلة على الجهمية والمعطلة

- النووي الأشعري الجهمي لە شرح صحيح مسلم (٦٨/٣) تەحریفی سیفەتی (الغضب : تووڕەبوون، وە الرضا : ڕازیبوون) ی الله تعالى ئەکات و ئەڵێت : (مەبەست لە تووڕەبوونی الله تعالى دەرکەوتنی تۆڵەکردنەوەیەتی لەوانەی سەرپێچیان کردووە . . . وەک چۆن ڕازیبوونی واتە دەرکەوتنی ڕەحمەتی) .

- النووي **الأشعري الجهمي** لە **شرح صحيح مسلم (٦٨/٣)** تەحریفی سیفەتی (فرح : پێخۆشبوون) ی الله تعالی ئەکات و ئەڵێت : (وتەی ' الله تۆبەی بەندەکەی زیاتر پێخۆشترە لە یەکێکتان کە ونبووەکەی ئەدۆزێتەوە لە چۆڵەوانیەکدا '، پێخۆشبوونی الله ڕازیبوونیەتی) .

وەکو پێشتر وتمان ئەو جەهمیانەی کە خۆیان وا پیشان ئەدەن سیفەتەکانی الله تعالی قبووڵ ئەکەن، دێن سیفەتە حەقیقیەکەی الله عز وجل بەو شتانە لێکئەدەنەوە کە لە ئەنجامی سیفەتەکەوە دەرئەکەوێت، بەمەش بەحسابی خۆیان خۆڵ ئەکەنە چاوی خەڵکی و لە جەهمیەت و زەندەقە خۆیان نەجاتداوە، بەڵام لە ڕاستیدا حەقیقەتی سیفەتەکان ڕەتکردووەتەوە .

ئەمجارەش النووي **الجهمي** سیفەتەکانی (الغضب و الرضا) تەحریف ئەکات بەو شتانەی لە ئەنجامی ئەو دوو سیفەتەوە دروست ئەبن، واتە کافرە بەوەی الله تعالی لە حەقیقەتدا سیفەتی تووڕەبوون و ڕازیبوونی هەبێت لە ذاتی خۆیدا .

وە سیفەتی الفرح یش تەحریف ئەکات بە الرضا، وە ڕازیبوونەکەش دووبارە تەحریف ئەکات بەو جۆرەی لە سەرەوە باسمان کردووە .

- ئیمام **حماد بن زید** رحمه الله ( **١٧٩هـ**) ئەڵێت : نمونەی جەهمیەکان وەك پیاوێکە پێی بوترێت : ئایا لە ماڵەکەتدا دار خورما هەیە؟

ئەڵێت : بەڵێ .

پێی بوترێت : گەڵای هەیە؟

ئەڵێت : نەخێر .

لق و پۆپی هەیە؟

ئەڵێت : نەخێر .

قەدی هەیە؟

ئەڵێت : نەخێر .

ڕەگی هەیە؟

ئەڵێت : نەخێر .

پێی ئەوترێت : کەواتە دار خورما نییە لە ماڵەکەتدا .

بەهەمان شێوە جەهمیەکان پێیان ئەوترێت : پەروەردگارتان هەیە؟

ئەڵێن : بەڵێ .

پێیان ئەوترێت : قسە ئەکات؟

ئەڵێن : نەخێر .

دەستی هەیە؟

ئەڵێن : نەخێر .

قاچی هەیە؟

ئەڵێن : نەخێر .

پەنجەی هەیە؟

ئەڵێن : نەخێر .

ڕازی ئەبێت و توڕە ئەبێت؟

ئەڵێن : نەخێر .

پێیان ئەوترێت : کەواتە ئێوە پەروەردگارتان نییە .

**شرح مذاهب أهل السنة لإبن شاهين، والحجة في بيان المحجة**

: کوللابی و ئەشعەریە جەهمیەکان ڕاستەوخۆ ناڵێن الله تعالی ڕازی نابێت و تووڕە نابێت، واتە ڕاستەوخۆ سیفەتەکە ڕەت ناکەوە، بەڵکو دێن تەحریفێک ئەکەن وەکو تەحریفاتەکانی النووي **الجهمي** و لەڕێگەیەوە سیفەتەکە پەک ئەخەن، لە کۆتاییدا ئەگەنە هەمان ئەنجامی جەهمیەکانی باوانیان .

وه ئەو سیفەتانەی حماد بن زید رحمه الله باسی کردووه فەرموودەی صحیح له رسول الله ـەوه ﷺ دەربارەیان هاتووه .

- ئیمام **إبن بطة** رحمه الله (**٣٨٧** هـ) ئەڵێت : (دەروازەی ئیمان هێنان بەوەی الله عز وجل تووڕه ئەبێت، وه ڕازی ئەبێت، وه خۆشیئەوێت و ڕقی لێی ئەبێت، وه جەهمیەکان ئەم هەموو سیفەتانه ڕەت ئەکەنەوه و ئینکاری ئەکەن و نەص ی قورئان و سوننەتی صحیح ڕەت ئەکەنەوه) .

**الإبانة الكبري**

- النووي **الأشعري الجهمي** له **شرح صحيح مسلم (٦٠/١٧)** تەحریفی سیفەتی (التَعَجُب : سەیرپێهاتن) ی الله تعالی ئەکات و ئەڵێت : (وتەی ﷺ ' الله سەرسامبوو به کارەکەتان ئەم شەو ' القاضي عياض واتای العجب بریتیه له ڕازیبوون، وه ئەکرێت مەبەستی ئەوەبێت فریشتەکان سەیریان پێهاتووه!) .

لێرەدا دووباره النووي سیفەتی العجب تەحریف ئەکات به ڕازیبوون، واته یەکەمجار خودی سیفەتی ڕازیبوونی تەحریف کرد به مانایەک لەگەڵ

عەقیدەی کەلامیە کوفریەکەی بگونجێت، پاشان هات سیفەتی الفرح و التعجب تەحریف کرد بە ڕازیبوون .

لەکاتێکدا ئەم سیفەتانە هەر یەکێکیان حەقیقین و مانای تایبەتی خۆیی هەیە و لێک جیاوازن .

وە بەڵگە بە وتەی عیاض ی جەهمی ئیمامی ئەهێنێت (ئەکرێت مەبەستی ئەوەبێت فریشتەکان سەیریان پێهاتووە!)، تەماشای ئەو تەحریفە سەخیف و منداڵانەیە بکە!

رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت (الله سەرسامبوو بە کارەکەتان ئەم شەو)، کەچی لەملاوە عیاض ە جەهمی ئیمامی النووي ە جەهمی ئەڵێت ئەکرێت مەبەستی فریشتەکان بێت!

بۆچی هەر ئەبێت ئاوا کافر بن بەرامبەر فەرموودەی رسول الله ﷺ؟ بۆچی رسول الله بەڕاست ناخانەوە لە وتەکانیدا؟ بۆ هەر ئەبێت تەحریفی وتەکانی بکەن؟ ئەمە چ باوەڕ بوونێکە بە رسول الله ﷺ؟

چونکە عەقیدەی کەلامیە جەهمیەتە کوفریەکەیان وای لێ کردوون قورئان و فەرموودە بەو شێوەیەی کە سەلەف وەریان گرتووە بە کوفری بزانن، وە وایپیشانی بدەن ڕووکەشی وتەی الله تعالى و رسول الله ﷺ کوفر و تەشبیهە! لەعنەتی الله لە خۆیان و لەوانەش کە بەرگریان لێ ئەکەن .

- ئیمام إبن بطة رحمه الله (٣٨٧ هـ) باب ێکی داناوه بەناوی (باوەڕبوون به سەیرپێهاتن) .

سیفەتی سەیرپێهاتنیش وەک چۆن له فەرموودەکەی رسول الله ﷺ دەرئەکەوێت : (إن الله یعجب لشاب لیس له صَبوة) واته الله سەیری به گەنجێک دێت له صَبوة ی نییه .

صَبوة واته منداڵێتی و گەنجیەتی، چونکه وەکو ئەزانن کەسێکی گەنج لەڕووی توانای جەستەی و حەز و ئارەزووەوه له ئەوپەڕیدایه، جا ئەگەر گەنجێک لەو پەڕی توانایدا خۆی بگرێتەوه لەکاتێکدا ئەم هەموو شته خراپه هەیه و گەنجەکانی تریش پێیەوه ئالوودە بوون، ئەوە گەنجەکە شایەنی ئەوەیه پێی سەرسام ببیت چونکه وەلانانی هەوا و ئارەزووی لێ چاوەڕێ ناکرێت .

# النووي الأشعري الجهمي و عەقیدەی دەربارەی ئەو کەسەی ئەڵێت قورئان مخلوق ـە

لەلای النووي **الجهمي** هەر کەسێک بڵێت قورئان مخلوق ـە ئەوە کافر نییە بەڵکو تەنها بیدعەچیە، لەکاتێکدا زۆرترین بابەت لە کتێبەکانی سەلەفدا رحمهم الله قسەی لەسەر کرابێت بریتیە لەوەی (قورئان کەلامی الله یە غیر مخلوق ـە، ئەوەی بڵێت مخلوق ـە کافرە) بەشێوەک ئەوەی کتێبەکانیان بخوێنێتەوە هیچ شک و گومانێکی نامێنێت لە کافرێتی هەر کەسێک شتێکی وا بڵێت تەنها کەسێکی لادەر و هەڵخلیسکاو لە مەنهەجی سەلەف نەبێت .

- النووي **الأشعري الجهمي الزنديق** لە **شرح مسلم (٣٨/٢)** ئەڵێت :
(ئەوەی بڵێت قورئان مخلوق ـە ئەوە بیدعەچیە، هاوەڵانمان ڕاجیاوازیان تێدایە لە تەکفیرکردنی، وە القفال و زۆرێک لە هاوەڵانمان ئەڵێن جائیز و ڕێگە پێدراوە شوێنپێی ئەو کەسە هەڵبگیرێت کە ئەڵێت قورئان مخلوق ـە، وە بێجگە لەوانیش لە بیدعەچییەکان، وە خاوەنی (العدة) ئەڵێت ئەوە صواب ـە، منیش ئەڵێم ئەوە صواب ـە .

أبو بكر البيهقي و بێجگە لەو لە هاوەڵانمان تەئویلی ئەوەیان کردووە کە لە الشافعي و زانایانی ترەوە هاتووە لە تەکفیرکردنی کەسێک ئەڵێت قورئان مخلوق ە بەوەی مەبەست پێی کوفرانەی نیعمەتە نەوەک کوفرێک لە میللەت بیکاتە دەرەوە) .

لێرەدا باسی سێ بابەت ئەکات ئەم جەهمیە، یەکەمیان ئەڵێت ئەوەی بڵێت قورئان مخلوق ە ئەوە بیدعەچیە کافر نییە .

دووەم بابەت ئەڵێت ئەکرێت شوێنپێی ئەو کەسە هەڵبگیریت کە ئەڵێت قورئان مخلوق ە، وە النووي **الجهمي** ئەمەی لەلا صواب ە .

وە سێیەم بابەت ئەڵێت البيهقي **الجهمي** تەحریفی وتەی ئیمامی الشافعي و زانایانی تری سەلەفی کردووە رحمهم الله، وە کوفرەکە کوفری گەورە نییە بەڵکو کوفری بچووکە .

تەماشا بکە رحمک الله **عبدالله ی کوڕی ئیمام أحمد** لە **(كتاب السنة)** لە سفیان بن عیینة ەوە نقڵ ئەکات کە ئەڵێت : (قورئان کەلامی الله یە عز وجل، هەر کەسێک بڵێت مخلوق ە، ئەوە کافرە، وە ئەوەشی گومانی لە کوفرەکەی هەبێت ئەویش کافرە) .

لەلای سەلەف ئەوە بڕاوەتەوە کە ئەوەی بڵێت قورئان مخلوق ە کافرە، بەڵکو باسی ئەوەش کراوە هەر کەسێک شکی لە کوفری ئەو کەسە هەبێت کە ئەڵێت قورئان مخلوق ە ئەویش کافرە !

تەماشا بکە وتەی سەلەف رحمهم الله وە وتەی النووي **الأشعري الجهمي** و البيهقي **الأشعري الجهمي** چەندە دوورە لە وتەی سەلەفەوە .

وە لەلای سەلەف ئەمە کوفرێکی ئاشکرایە، ئیمام **حرب الكرماني** لە (كتاب السنة) کە ئیجماعی زانایانی تێدا نقڵ کردووە ئەڵێت : (قورئان کەلامی الله یە قسەی پێکردووە مخلوق نییە، وە هەر کەسێک بڵێت مخلوق ە ئەوە جەهمیەکی کافرە .

وە ئەڵێت گوێم لە أحمد بن حنبل بوو لەلایدا باسی قسەی خەڵکی کرا لە قورئاندا بەوەی مخلوق ە .

دووجار وتی : کوفرێکی دیار و ئاشکرایە) .

وە ئیمام **الدارمي** لە **(نقض علي المريسي)** دەربارەی جەهمیەکان ئەڵێت : (ئێمە تەکفیریان ئەکەین بە کوفرێکی بەناوبانگ و ناسراو، ئەوەش بریتیە لە بەدرۆخستنەوەی دەقی قورئان، الله تبارك وتعالى هەواڵی داوە کە قورئان کەلامیەتی، بەڵام جەهمیەکان بانگەشەی ئەوەیان کرد کە دروستی کردووە) .

النووي **الجهمي** ئەڵێت کە البيهقي **الجهمي** وتەکەی ئیمامی الشافعي رحمه الله تەئویل کردووە، بەڵام ئەمە وتەیەک نییە تەئویل بکرێت، چونکە تەواوی وتەی سەلەف لەگەڵ وتەی ئیمامی الشافعي ـە، وە وتەکەش زۆر ڕوونە لە تەکفیرکردن .

ئیمام **الآجري** لە کتێبی (**الشريعة : ١٨٨**) ئەڵێت : (قورئان کەلامی الله تعالى یە مخلوق نییە، لەبەر ئەوەی قورئان لە عیلمی الله یە وە علیمی الله مخلوق نییە، الله گەورەتر و بەرزترە لەوە، قورئان و فەرموودە، وە وتەی هاوەڵان رضي الله عنهم و وتەی زانایانی ئیسلام بەڵگەن بۆ ئەوە، وە هیچ کەسێک ڕەتی ناکاتەوە تەنها جەهمیەکی پیس نەبێت، وە جەهمیەکان لەلای زانایان کافرن .

وە (**الشريعة : ٢١١**) موناقەشەکەی نێوان الشافعي رحمه الله وە حفص الفرد لعنه الله نقڵ ئەکات :

الربيع بن سليمان وتی : گوێم لە الشافعي بوو باسی قورئانی کرد، وە باسی ئەوەی کرد حفص الفرد ئەیڵێت، وە الشافعي رحمه الله پێی ئەوت حفص المنفرد، وە موناقەشەی لەگەڵ کرد بە ئامادەبوونی والیەک لە مصر، الشافعي لە موناقەشەکەدا پێی وت : (سوێند بەو پەرستراوەی کە هیچ پەرستراوێک بە حەق شایەنی پەرستن نییە بێجگە لە ئەو کافر بوویت) .

پاشان هەستان و ڕۆیشتن، گوێم لە حفص بوو وتی : (سوێند بەو پەرستراوەی کە هیچ پەرستراوێک بە حەق شایەنی پەرستن نییە بێجگە لە ئەو ویستی بمکوژێت) .

گوێم لە الشافعي بوو وتی : (قورئان کەلامی الله یە غیر مخلوق ە، ئەوەی بڵێت مخلوق ە کافرە) .

الربیع بن سلیمان وتی : (قورئان کەلامی الله یە غیر مخلوق ە، ئەوەی بڵێت مخلوق ە کافرە) .

وە لە (سير أعلام النبلاء : ١٠/٣٠) محمد بن إسحاق بن خزیمة ئەڵێت : گوێم لێبوو الربیع بن سلیمان وتی : (کاتێک الشافعي قسەی لەگەڵ حفص الفرد کرد ، حفص وتی : قورئان مخلوق ە .

الشافعي وتی : سوێند بە الله ی العظیم کافر بوویت) .

ئەم وتەیانەی ئیمام الشافعي زۆر ڕوونە لە تەکفیری حفص الفرد کە وتوویەتی قورئان مخلوق ە .

بەڵام تەحریفکردنی وتەکان ئیشی کۆن و ئێستای ئەشعەریە جەهمیە جەهەنەمیەکانە، ئەو زەندیقانە ئەوەندە ڕووقایمن کەلامی الله و وتەی رسول الله ﷺ تەحریف ئەکەن چجای بگات بە وتەی زانایەنی سەلەف !

جگە لەوەش زانایانی سەلەف رحمهم الله حوکمەکانی مورتەدیان جێبەجێ کردووە لەسەر کەسێک وتبێتی قورئان مخلوق ە :

ئیمام **اللالكائي** لە **(شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة)** باب ی دائەنێت و ناوی ئەو زانایانە ئەهێنێت کە تەکفیری ئەو کەسانەیان کردووە کە وتوویانە قورئان مخلوق ە .

پاشان باب ێکی تری داناوە دەربارەی ئەو زانایانەی وتوویانە (نە میرات وەرئەگرێت، وە نە میراتی وەرئەگیرێت) پاشان وتەی زانایان ئەهێنێتەوە .

پاشان باب ێکی تری داناوە دەربارەی ئەو زانایانەی وتوویانە (ژنەکانیان تەلاقیان کەوتووە) پاشان وتەی زانایان ئەهێنێتەوە .

پاشان باب ێکی تری داناوە دەربارەی ئەو زانایانەی وتوویانە (هاوسەرگیریان لەگەڵ ناکرێت و نوێژیان لەپشتەوە ناکرێت و . . . وە موالاتی ئیسلامەتیان نەماوە لەگەڵ موسوڵمانەکاندا) پاشان وتەی چەندین زانای سەلەف بە بەڵگە ئەهێنێتەوە .

کوفرێک کە دژی دەقی قورئان و فەرموودە بێت و زانایانی سەلەف بە کوفرێکی ئاشکرا و دیار ناساندبێتیان و تەکفیری ئەو کەسەش کرابێت کە شکی هەیە لە کوفری ئەو کەسەی قسەکە ئەکات و زانایان حوکمیان بەسەردا دابێت بەوەی کافر و جەهمین و خراپترن لە یەهوود و نەسڕانیەکان و بڵێن تەڵاقی ژنەکانیان کەوتووە و میراتیان لێ وەرناگیرێت و میرات وەرناگرن و هاوسەرگیریان لەگەڵ ناکرێت و هیچ موالاتێکیان لەگەڵ موسوڵمانادا نەماوە و سەردانی نەخۆشیان ناکرێت و نوێژیان لە پشت ناکرێت و نوێژ لەسەر جەنازەیان ناکرێت، لەپاش ئەم هەموو بەڵگەیە هیچ کەسێک گومانی نامێنێت لە کوفری ئەو کەسەی ئەڵێت قورئان مخلوق ە تەنها ئەوانە نەبێت دڵ و چاویان کوێر بووە لە ئاست حەق و وەری ناگرن و ئیللا بە فەهمی خەلەف نەبێت .

# النووي الأشعري الجهمي و بەشێکی تر لە کوفر و گومڕاییەکانی

النووي **الجهمي** ئەڵێت کە الخضر هێشتا زیندووە و نەمردووە، وە ئەڵێت ئەمە جێی یەکدەنگیە لەلایەن سۆفیەکان!

- النووي **الأشعري الجهمي** لە (شرح صحيح مسلم : ١٣٥/١٥) دەربارەی الخضر ئەڵێت : (زانایان بە گشتی لەسەر ئەوەن کە زیندووە و لەناوماندایە، ئەوە جێی یەکدەنگیە لەلای سۆفیەکان، وە لەلای ئەهلی مەعریفەت) .

ئەوەی ئەم جەهمیە باسی ئەکات و باوەڕی پێیەتی هیچ نییە جگە لە عەقیدەی سۆفیە گەمژە قەبرپەرستە بێعەقڵە خاوەن عەقیدە خورافیاتەکان نەبێت .

- إبن القيم لە کتێبی (المنار المنيف في الصحيح والضعيف) باسی بابەتەکە ئەکات لە سەلەف ەوە :

- پرسیار کرا لە إبراهيم الحربي دەربارەی تەمەن و زیندوویی الخضر؟

وتی : (تەنها شەیتان ئەمەی بڵاوکردووەتەوە لە نێوان خەڵکیدا) .

وە پرسیار لە البخاري کرا دەربارەی الخضر و إلياس ئایا زیندوون؟

وتی : (چۆن شتی وا ئەبێت لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێت : لەوانەی کە ئەمڕۆ ئەژین لەسەر زەوی دوای سەد ساڵ هیچ کەسێکیان بە زیندووی نامێنن).

وە پرسیار کراوە لە بێجگە لە ئەو لە زانایان، ئەمەیان خوێندووەتەوە : ﴿ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ ﴾ (الأنبياء : ٣٤) .

وە دەربارەی پرسیار کرا لە إبن تيمية وتی : (ئەگەر الخضر زیندوو بووایە ئەوە واجب بوو لەسەری کە بێت بۆلای پێغەمبەر ﷺ و جیهادی لەگەڵدا بکات و لێوەی فێرببێت) .

وە القاضي أبو يعلى لە هەندێک لە هاوەڵانی أحمد ەوە ڕیوایەتی کردووە کە الخضر مردووە) .

ئەتوانن بگەڕێنەوە بۆ کتێبەکە چەند وتەیەکی تری نقڵ کردووە .

- النووي **الأشعري الجهمي** لە **(مجموع شرح المهذب : ٢٥/١)** باسی عەقیدە کوفریەکەی خۆیان ئەکات و ئەڵێت : (جیاوازیان تێکەوت دەربارەی ئایەت و فەرموودەکانی سیفات کە ئایا تەئویل ئەکرێت یان نا؟ کۆمەڵەیەک وتیان تەئویل ئەکرێت، ئەمەش بەربڵاوترین مەزهەبی موتەکەلیمینەکانە، وە کۆمەڵەیەکی تر وتیان تەئویل ناکرێت، وە قسە ناکرێت دەربارەی ماناکەی، بۆ نمونە ئەوترێت ئیمانمان هەیە بەوەی الله بەرز بووەتەوە بۆ سەر عەرش، بەڵام نازانین واتاکەی چییە، وە مەبەست پێی چییە) .

بۆ دووبارە و دەبارە النووي **الجهمي** عەقیدەی کوفری (تفويض و تحريف) لە بابەتەکانی سیفاتەکانی الله تعالى دا بە عەقیدەی ئەهلی سوننە ئەناسێنێت، وە هەروەها خۆی باوەڕی بە هەردوو ئەو مەزهەبە کوفریە هەیە و کاریان پێ ئەکات لە کتێبەکانیدا، لەکاتێکدا هەردوو مەزهەبەکە لەلای سەلەفی ئوممەت کوفر و پەکخستنی سیفەتەکانی الله تعالى ن .

تەماشا بکە رحمک الله ئیمام **يزيد بن هارون** رحمه الله (**٢٠٦** هـ) ئەڵێت : (هەر کەسێک وا گومان ببات | **الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ** | (**طه : ٥**)

بە شێوەیەکە جیاواز لەوەی کە لە دڵی خەڵکیدا جێگیر بووە ئەوە جەهمیە) .

**السنة لـ عبدالله بن الإمام أحمد**

: ئەوەی لە دڵی خەڵکیدا جێگیر ئەبێت کاتێک ئەبیستێت الله عز وجل لەسەر عەرش بەرزبووەتەوە هەر مانای ڕووکەشی ئایەتەکەیە، بەرز بووەتەوە تەواو بەڵام النووي **الجهمي** دڵی هێندە کوفر و زەندەقە و کوفری کەلام و جەهمیەتی نۆشیوە شتێک نازانێت کە هەموو کەسێکی ئاسایی ئەیزانن بۆ ئەوەی خۆی لە مانای ئایەتەکە بدزێتەوە (ئەوترێت ئیمانمان هەیە بەوەی الله بەرز بووەتەوە بۆ سەر عەرش، بەڵام نازانین واتاکەی چییە، وە مەبەست پێی چییە) .

ئەمە جەهمیەت و کوفرە، ئەمە ڕاکردنە لە ئایەت و فەرموودە، ئەمە خۆدزینەوەیە لە حەق، وە لەلای گومڕا و گومڕاکەران ئەم جەهمیە خزمەتی ئیسلامی کردووە! ئەی ئەم هەموو جەهمیەتەی نابینن کوێرن؟

وە مەنهەجی سەلەف زۆر دوورە لەوەی ئەم جەهمیە باسی لێوە کردووە، مەنهەجی سەلەف رحمهم الله بریتیە لە جێگیرکردنی هەموو ئەو سیفەتانەی کە لە قورئان و فەرموودە و ئاثارەکاندا هاتووە لەسەر مانای ڕووکەش بەبێ چۆنیەتی بۆ دانان و پەکخستنی حەقیقەت و چواندنی بە دروستکراوەکانی .

عبدالله بن مسعود ـەوە رضي الله عنه ئەفەرموویێت : زانایەک لە زانایانی یەهود هاتە لای ﷺ علیە وسلم پێی وت : ئەی محمد؛ ئێمە بیستوومانە کە الله ئاسمانەکان دائەنێت لەسەر پەنجەیەکی، وە زەویەکان لەسەر پەنجەیەکی، وە

داروودرەخت لەسەر پەنجەیەکی، وە ئاو و خۆڵ لەسەر پەنجەیەکی، وە درووستکراوەکانی تریش لەسەر پەنجەیەکی، ئەفەرموویێت : من پاشام.

پێغەمبەر ﷺ پێکەنی تا ددانەکانی پشتەوەی دەرکەوت وەک بەڕاستخستنەوەی بۆ وتەی زاناکە .

**صحيح البخاري ومسلم**

- ئیمام **عبدالله بن أحمد بن حنبل** ئەڵێت : باوکم وتی یحیی بن سعید القطّان بە پەنجەکانی ئاماژەی ئەکرد، وە باوکمم بینی چۆن ئاماژەی بە پەنجەکانی ئەکرد، پەنجەی دائەنا دانە بە دانە تا ئەگەشتە کۆتایەکەی .

**(السنة : ٤٨٩)**

تەماشا بکە رحمک الله سەلەف تێگەیشتوون لە فەرموودەکانی سیفات و زانیویانە مانای چییە، نەک وەکو ئەوەی النووي الجهمي ئەیلێت .

ئەمە بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی سەلەف رحمهم الله موفەویضە نەبوون و مانای ئایەت و فەرموودەکانی سیفاتیان زانیوە، نموونەیەکی دیکە :

- لە أبي هريرة ـەوە رضي الله عنه دەربارەی فەرمایشتی الله تعالى | **إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا** | **(النساء : ٥٨)**

ئەفەرمووێت : رسول الله ﷺ م بینی پەنجەگەورەی لەسەر گوێی وە ئەوانەی بەدوایەوە دێن لەسەر چاوی دائەنا .

إبن یونس ئەڵێت : المقرئ ئەیوت : | **إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا** | واتا : الله بیستن و بینینی هەیە.

أبو داود ئەڵێ : ئەمە ڕەددە بۆ جەهمیەکان.

**(سنن أبي داود : ٤٧٢٨)**

وە ڕەددە بۆ موفەویضە پەکخەرەکان کە ئەڵێن نازانین واتای سیفەتەکانی الله تعالى چییە، کە یەکێکە لەو دوو عەقیدەیەی کە النووي الجهمي خاوەنیەتی .

# النووي الأشعري الجهمي و دابەشکردنی بیدعە بۆ چاک و خراپ

- النووي **الأشعري الجهمي** لە **(تهذيب الأسماء واللغات : ٢٢/٣)** باسی بیدعە ئەکات و ئەڵێت دابەش بووە بۆ دوو جۆر : (بیدعەی چاک و بیدعەی خراپ) .

هەمیشە کەسانی لادەر و گومڕا لە ڕێگای حەق ئەیانەوێت بە هەر ڕێگەیەک بووە لادان و گومڕاییەتیەکەی خۆیان بشەرعێنن، وەکو کەسێک کە بیدعەیەک دائەهێنێت و ئەڵێت بیدعە چاکی هەیە و خراپیشی هەیە بۆ ئەوەی ئەو بیدعەیەی خۆی دایهێناوە بیشەرعێنێت، چونکە لەلای هەموو خاوەن عەقڵێک ئاشکرایە هیچ کەسێک بە بیدعەی خۆی ناڵێت خراپ، لەکاتێکدا لەلای سەلەفی ئوممەت هەموو بیدعەیەک خراپ بووە .

بەڵام ئەم کەسە بیدعەچیانە بۆ شەرعاندنی بیدعەکانی خۆیان کێشەیان نییە قورئان و فەرموودەش بەدرۆ بخەنەوە یان بیگۆڕن، وەک چۆن لە بابەتی ناو و سیفاتەکانی الله تعالى کردوویانە و ئەیکەن .

- إبن عمر رضي الله عنهما ئەفەرمووێت : (هەموو بیدعەیەک گومڕاییە ئەگەر خەڵکیش وایببینن کە باشە) .

**السنة لـ محمد بن نصر المروزي : ٨٣**

: تەماشاکە فەرمووی : (ئەگەر خەڵکیش وایببینن کە چاکە)، واتە ئەگەر خەڵکی یان زانایانی گومڕا بڵێن ئەم بیدعەیە چاکە ئەوە شتێک نییە بەناوی بیدعەی حەسەنە .

- ئیمامی **مالک** رحمە الله ئەڵێت : (وە هەر کەسێک بیدعەیەک داهێنێت لە ئیسلامدا و بە باشی بزانێت ئەوە وتوویەتی کە محمد ﷺ خیانەتی لە پەیامەکەی کردووە، چونکە الله ئەفەرمووێت : | **ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ** | (المَائِـدَة : ٣) .

جا ئەوەی ئەو ڕۆژە دین نەبووبێت ئەمڕۆش دین نییە) .

**الإبانة الكبرى**

وە کاتێک کەسێک نامەیەک بۆ ئیمامی الأوزاعي (١٥٧ ھ) رحمه الله ئەنووسێت و لە نامەکەدا پرسیاری لێ ئەکات: ئایا بەڕاستی تۆ ئیمانداریت؟

ئیمامی الأوزاعي لە وەڵامدا ئەڵێت: ئەو بابەتەی پرسیاری لەبارەوە ئەکەیت بیدعە یە (إن المسألة عما تسأل عنه بدعة)... هەتا کۆتایی نامەکە.

واتە ئیمامی الأوزاعي یەکەم شت بەکاریهێنا بۆ ڕەخنەگرتن و بەتاڵکردنەوەی پرسیارەکەی بریتیبوو لەوەی کە بە کابرای وت: (ئەو بابەتەی تۆ پرسیاری لەبارەوە ئەکەیت #بیدعە یە).

واتە بیدعە شتێکی خراپ و بێزراوە بۆیە ئیمامی الأوزاعي بەوە ڕەخنەی لە کابرا گرت، بەڵام هەمیشە ئەهلی بیدعە لە هەوڵی ئەوەدان بڵێن کە بیدعەی حەسەنە هەیە!

ئاخر ئەگەر ئەوان تێبگەیشتیانە لە بیدعە داهێنان لە دیندا ئەوە هەرگیز ئەو قسەیەیان نەئەکرد، چونکە وشەی بیدعە لە دیندا خۆی خراپە، واتە تۆ ئەڵێیت فلانە شت کوفرە، یان فلانە شت شیرکە، ئایا ئەکرێت کەسێکی تر لەولاوە بڵێت: کاکە ئەمە کوفری حەسەنە یان شیرکی حەسەنەیە!

بێگومان ئەوکاتە قسەی کابرا ڕەتئەکەیتەوە، جا بیدعەش بە هەمان شێوەیە، بیدعە داهێنان لە دیندا لە ئەسڵدا خراپە، ئەگەر تەماشای وەڵامەکەی ئیمامی الأوزاعي رحمه الله بکەیت ئەم ڕاستیەت بۆ دەرئەکەوێت.

پاشان گریمان قسەکەی تۆ ڕاستە و بیدعەی حەسەنە هەیە، ئەی باشە بیدعەی حەسەنە چییە؟ کامە بیدعەی حەسەنەیە و کامەش بیدعەی خراپە؟ ئایا بە هەوا و ئارەزووی کێ بڕیار لەسەر ئەوە بدەین کە کامە بیدعە باشە و کامە خراپە؟ ئەگەر من بیدعەیەکم داهێنا و وتم ئەمە بەڕای من باشە و تۆش وتت خراپە کاممان ڕاست ئەکەین؟ ئەی ئایا ئەکرێت هەر حیزب و کۆمەڵێک چەند بیدعەیەک داهێنن و بڵێن ئەم بیدعەیە بەڕای ئێمە چاکە؟! ئەی باشە تا ئەگەر خەڵکی هەمووی دەست بکەن بە بیدعە دانان کەسیان بە بیدعەکەی خۆی ئەڵێت خراپ؟ بێگومان نەخێر .

نامەکە لە کتێبی **الإبانة الكبرى** و **شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة** هاتووە

- النووي **الأشعري الجهمي** لە **(روضة الطالبين : ٢٠٦/٣)** ئەڵێت : (ئەگەر کەسی سەربڕ بڵێت بەناوی اللە و بە ناوی محمد، وە مەبەستی سەربڕین بێت بە ناوی اللە، وە تەبەروک کردن بە ناوی محمد، ئەوە پێویستە بە حەرام دانەنرێت) .

- ئیمامی **الشافعي** رحمه الله ئەڵێت : (وە ئەگەر سەربڕینێکی تریان هەبوو بێجگە لە ناوی الله تعالى یان لەسەر ئەهێنا وەکو ناوە المسيح، یان سەریان ئەبڕی بە بێجگە لە ناوی الله تعالى ئەوە ئەو سەربڕاوانەیان حەڵاڵ نییە) .

**الأم**

**البغوي** لە تەفسیری ئایەتی : | **حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ** | ئەڵێت : (ئەوەی لە سەربڕینەکەیدا ناوی بێجگە لە الله تعالى ی لەسەرهێنراوە) .

**تفسير البغوي**

إبن تيمية ئەڵێت : (الله سبحانه ئەوەی کە لەسەر نصب سەربڕدراوە بە حەرامی داناوە، ئەویش بریتیە لەوەی سەرئەبڕدرێت بۆ بێجگە لە الله، وە ئەوەی ناوی بێجگە لە الله ی لەسەر ئەهێنرێت) .

**مجموع الفتاوى**

وە ئەڵێت : (کەسی موسوڵمان ئەگەر بۆ بێجگە لە الله سەرببڕێت، یان سەرببڕێت بە بێجگە لە ناوی الله ئەوە - سەربڕاوەکەی - حەڵاڵ نییە، وە بەوە تەکفیر ئەکرێت) .

**إقتضاء الصراط المستقيم**

هەر کەسێک لەگەڵ ناوی الله تعالى دا ناوی هەر کەسێکی تر بهێنێت لەکاتی سەربڕیندا ئەوە پێی کافر ئەبێت، وە سەربڕاوەکەی حەرام ئەبێت، بەڵام النووي الجهمي ئەڵێت نابێت تەنانەت سەربڕاوەکەش بە حەرام بزانیت!

ئەمەش عەقیدەی النووي الجهمي یە کە کەسانێک زیاتر لە سیفەتەکانی الله تعالى بەرگری لە سیفەتەکانی النووي الجهمي ئەکەن و بە ئیمام و ئەهلی سوننە نەبێت ناوی ناهێنن و تەکفیرکارانی بە خەواریج و سەگی ئاگر ئەزانن لەکاتێکدا چەند کوفر و گومڕاییەکی هەیە .

بە دڵنیاییەوە کوفر و جەهمیەت و زەندەقە و بیدعە و گومڕاییەکانی النووي زیاترە لەوەی ئێمە لەم کتێبە بچووکەدا کۆمان کردووەتەوە

والحمدلله رب العالمين، والصلاة والسلام على سيد المرسلين

**https://t.me/imamakany_kufr**